# پێنج کاتژمێر لەگەڵ (برایم ئەحمەد)دا

حوسێن محەمەد عەزیز

2702ک /2002ز

**بۆ هەموو ئەوانەی، لە پێناوی ڕاستییدا، وەک مۆم دەسوتێن و سڵ لە هیچ ناکەنەوە!**

# پێشــەکیی چاپی سێیەم

ســـاڵی «2000-2001 » ، بۆ جاری شەشەم، سەردانێکی دیکەی کوردستانم کردەوە. ئەوەی لەو سەردانەدا، زۆر دڵخۆشکەربوو، ئەوەبوو، ماوەی چوار مانگ مامەوە، هێندێ بەرهەمی کۆن و نوێی خۆمم چاپکردەوە، گەلێ دۆست و برادەری نازیزیشم بینی. هێندێکیان، داوایان لێ کردم، ئەو دوو چاوپێکەوتنەی، لەگەڵ هەر دوو مامۆستا « برایم ئەحمەد و جەرجیس فەتحوڵلا »دا سازمکردبوو، ڕێیانبدەم، سەرلەنوێ چاپیانکەن و بڵاویانکەنەوە. منیش، گەلێکم پێ باشبوو، بەو مەرجەی جارێکی دیکە، بە ڕێنووس و هەڵەی چاپەکانیاندا بچمەوە، نیشانەکانی « خاڵبەندیی »یان بۆ دانێم. بەپێی توانا و لە سنووری زانینی خۆمدا، ووشە بیانییەکانی دیکەی تێیاندا ماوە، بژارایانکەم و بە ووشەی کوردیی ڕەسەن و پەتیی بیانڕازێنمەوە. جگە لەوەی، پێشەکیی نوێیان بۆ بنووسم. دەربارەی ئەو هەواڵ و دەنگۆیانەی، لە سەر هەر دوو چاوپێکەوتنەکەش نووسراون و بیستوومن، لە پێشەکییەکانیاندا، وەڵامێکی کورتیان بدەمەوە، تا چی دیکە لەوە پتر، ئەو جۆرە کەسە سک پڕ لە کێمی بوغزانە، « تفەنگ بە تاریکەشەوەوە نەنێن ! ». هەروەها، چەن گوتارێکی تایبەتییشیان، لەگەڵدا چاپکەم، ئەو کاتە بڵاویانکەنەوە.

ئەم دوو چاوپێکەوتنە، جگە لەوەی، لە لایەن پارتە کوردستانیی و کۆمەڵانی خەڵکەوە، بێ ئەوەی پرس بە خۆم بکەن، بە هەزاران دانەیان لێ کۆپیکراوە، هێندێ کەسیش، پارەیەکی باشیان پێ پەیداکردووە، تا ئێستەش، بایەخی تایبەتیی خۆیان هەر ماوە.

ئەوەی خۆم ئاگام لێ بووبێ و پێشەکیی نوێم بۆ نووسیبێ، چاوپێکەوتنەکەی مامۆستا « برایم ئەحمەد » بوو. تا ئێستە، دوو جار چاپ و بڵاوکراوەتەوە. جاری یەکەم: لە « سوید » و لە لایەن چاپخانەی « باران » ، جاری دووەمیش: لە «کوردستان ـ سولەیمانیی » ، لە لایەن چاپەمەنیی « ئەزمەر »ەوە بڵاوکراوەتەوە. کەچیی، ئەوا پتر لە شەش ساڵ، بە سەر چاپی یەکەم و پێنج ساڵ، بە سەر چاپی دووەمدا تێپەڕدەبێ، لەم ماوەیەدا، گەلێ گۆڕانکاریی گرنگ، لە « کوردستان،

ناوچەکە و جیهان »یشدا روویداوە، لە سەروو هەموشیانەوە، کارەساتی جەنگی چەپەڵی نێوخۆی نێوان « پارتیی و یەکێتیی » لە « باشووری کوردستان » دێ، کە نزیکەی پتر لە چوار ساڵی خایاند و تا ئێستەش، بە تەواویی پۆلوی نێو ئاگردانی جەنگەکە نەکوژاوەتەوە. هەروەها، مامۆستا « برایم »یش، ماڵاوایی لێ کردین و ئەم یادگارەی بۆ جێهێشتین.

لێرەدا دەمەوێ، بڵێم: هێشتا، ناوەڕۆکی ئەم چاوپێکەوتنە هەر زیندووە و تۆزی مێژووی لێ نەنیشتووە. زۆربەی ئەو باسانەی لێشی دواوین، بۆ ئەوڕۆش، دەست دەدەن. بەڵام، ئەوەی زۆر دڵگرانی کردم و پێویستە، پەنجەی بۆ ڕاکێشم و ڕوونی کەمەوە، چەن خاڵێکی سەرەکیی بوو:

1. هێندێ کەسی بێ وێژدان هەن، لەم لا و لەو لا، قسەی بێ سەروبەر و بێ بەڵگەیان فڕێداوە، گوایە: ئەوەی لە دووتوێی ئەو چاوپێکەوتنەدا هاتووە، هەمووی قسەی مامۆستا « برایم » نییە. بەڵکوو، هێندێکی خۆم ڕێکمخستوون! سەیر ئەوەیە، تا مامۆستا خۆی لە ژیاندا بوو، چاوپێکەوتنەکە، دوو جار چاپ و بڵاوکرایەوە، چەن جارێکیش، چاومان بە یەکدی کەوتووە. کەچیی، لەو بارەیەوە، نەک هەر هیچی نەگوت، بەڵکوو، دەستخۆشانەشی لێ کردم! تەنیا ئەوە نەبێ، جارێکیان لە « بەلچیکا » بینیم، گوتی: دوو ووشە هەیە، لە جێی خۆیدا بەکار نەهاتووە، گوتم: کامانەن؟ گوتی: « نەریتنامە و پەنجەمۆر »، لەبری « دەستوور و ئیمزا »ی عەرەبیی نووسراوە. ئەوانە هەڵەن، هەر خۆیان بەکاریێنی باشترە. منیش، باوەڕم بە قسەکەی هێناو و بەڵێنمدایە، لە چاپەکانی داهاتوودا، ڕاستیان کەمەوە. ئەوا لەم چاپە نوێیەدا، ئەو دوو ووشەیە ڕاستدەمەوە، هەر بەو شێوەیەی مامۆستا « برایم » پێی باشتر و ڕاستتربوو، دەیانووسمەوە.

جگە لەوەی، چاوپێکەوتنەکەش لە سەر کاسێت تۆمارکراوە و ماوە، بۆ ئەوەی، دژی ئەوانەی ئیرەیی و ڕکوکینە، نێو سکی خواردوون، وەک بەڵگەیەکی مێژوویی لەچاوچەقیو بێنێ. بەڵام، هەر وەک چەن جارێ، لە پێشەکیی بەرهەمەکاندا نووسیومە و ڕوونمکردۆتەوە، گەر دەقێکی دیاریکراو، لە سەرچاوەیەکی تایبەتییەوە وەرگرم، ئەوا، هەموو ووشە بیانییەکانی وەردەگێڕم و بە کوردیی دەیاننووسمەوە. تەنانەت، کاتی خۆی ئەوەشم بە مامۆستا « برایم » گوت و هیچی نەگووت. چونکە، هەموو نووسەرێ ئازادە، بە چ شێوە و زمانێکی وێژەیی، بەرهەمەکانی خۆی دەڕازێنێتەوە و بڵاویاندەکاتەوە. گرنگ ئەوەیە، ڕاستگۆ و دەستپاکبێ، دەستکاریی ناوەڕۆکی وتووێژەکە نەکا و نەیشێوێنێ.

هەر بەو بۆنەیەوە، برایەکی دڵسۆز بۆی گێرامەوە، گوایە: خوێندکارێکی خرێندنی باڵای زانکۆی « سولەیمانیی »، ئەم چاوپێکەوتنەی وەک سەرچاوەیەک، بۆ کاری « ماجستێر »ەکەی بەکارهێنابوو. بەڵام، کاتێ ڈاکۆکیی لە کارنامەکەی کردبوو، دوکتۆر « عیزەدین مستەفا رەسووڵ »، گوتوویەتی: دەبێ، ئەم سەرچاوەیە لاببرێ. چونکە، ئەو قسانە لە قسەی مامۆستا « برایم » ناچن!

لێرەدا، زۆر بە ڕاشکاویی دەڵێم: مامۆستا خۆی، چۆن وەڵامی پرسیارەکانی داوەتەوە، هەر بەو شێوەیەش بڵاومکردۆتەوە و یەک پیتم لێ نەگۆڕیوە. تەنیا، ئەوە نەبێ، گەر لە هێندێ شوێندا، هێندێ ووشەی بە عەرەبیی گوتبێ، من بەرانبەرەکەیم بە کوردیی یا بە لاتینیی نووسیوە. وا بزانم، ئەمەش هیچ لە ناوەڕۆکی قسەکانی مامۆستا ناگۆڕێ، بۆ نموونە: مامۆستا، ئەم ووشە عەرەبییانەی بەکارهێناوە، « قەصاب، سیاسەت، سیاسی، طەبعا، سەفیر، سەفارەت، جنسیە، بەیان، ئیجازە، تەرشیح، ئیستیمارە، ڕەسمیی، مەکتەبی سیاسی، حیزب، عەقڵ، عاقڵ، کتێب، شاعیر، شیعر، مەلەکی، ئیحتیاط، کولیەی حقوق ... » من لە بری هەموو ئەو ووشانە نووسیومە: « گۆشتفرۆش، ڕامیاریی، ڕامیار، بێ گومان، باڵوێز، باڵوێزخانە، ڕەگەزنامە، بڵاڤۆک، مۆڵەت، پاڵاوتن، بلانکێت، فەرمیی، پەلیتبیرۆ، پارت، ژیریی، ژیر، پەرتووک، هۆنەر، هۆنراوە، پاشایەتیی، یەدەک، کۆلێژی مافناسیی ... ». ئەگینا، گەر مامۆستا گوتبێتی، « کوردستانی عێراق »، ئەز، « باشووری کوردستان »م نەنووسیوە، تا، دوکتۆر « عیزەدین » پێی نیگەرانبێ! هەروەها، ناوی مانگەکان، لەبری ئەوەی بە عەرەبیی بیانتووسم، بە ئینگلیزیی نووسیومن.

2. زۆر جار، لەگەڵ هێندێ دۆست و برادەردا، لە سەر ناوەڕۆکی نووسینەکە دەمەتەقێمانکردووە. هێندێ جار، ڕەخنەیان لە بۆچوونەکانی مامۆستا گرتووە، منیش، ئەوەی بە ڕاستم زانیبێ، نکولییم لێ نەکردووە و پشگیرییمکردووە. چونکە، هەر وەک، لە پێشەکیی چاپی یەکەمدا ڕوونمکردۆتەوە، من لەگەڵ هەموو بۆچوونەکانی مامۆستادا نەبووم. کەچیی، یەکێکی وەک « مەحموودی مەلا عیززەت »، دەربارەی چاوپێکەوتنەکەی « خولانەوە لە بازنەیەکی بۆشدا »، نامەیەکی بە عەرەبیی، بۆ « جەرجیس فەتحوڵلا » نووسیبوو. ئەویش، بە تێلیفۆن بۆی خوێندمەوە. جگە لەوەی، هێندێ قسەی زل و ناقۆڵای کردبوو، گوتبووشی: چاوپێکەوتنێکی زۆر « فاشیل » بوو، هەر دوای چاوپێکەوتنەکەش، لەم لاو لەو لا، قسەی بە مامۆستا « برایم » گوتووە و بە خراپە باسیکردووە!

لێرەدا، زۆر بە ڕاشکاویی دەڵێم: هەمیشە، باری سەرنجی خۆم، بەرانبەر بە مامۆستا دەربڕیوە. تا لە ژیاندا بوو، پێوەندییمان باشبوو، لە پێشەکیی چاپی یەکەمیشدا، زۆر شتم بە ئاشکرا نووسیوە. دوای ئەوەی ماڵاواییشیکرد، زۆر بە ڕاشکاویی، بۆچوونی خۆم لە گوتاری « خڕنووکیش لە بیاباندا درەختە! » دەربڕیوە، بەڵام، نازانم، مامۆستای مێژوونووس، ئەم هەواڵە گرنگەی، لە کام ئاژانسی دەنگوباسەوە وەرگرتووە؟ چونکە، گەر بڵێم: شتەکان بە پێچەوانەوە بووە، هەڵەم نەکردووە!
جگە لەوەی، من باش دەزانم و هەر دوو « دوکتۆر و مامۆستا »ش، باشتر دەزانن، گرفتەکە، لە نووسین و بیری چاوپێکەوتنەکەدا نییە، بەڵکوو، « مشتووی ناو هەمانەکە، هەر دووکیانی کوشتووە! ».
3. لە ڕاستییدا، هێندێ برادەر هەبوون، کاتێ، چاپی یەکەمی چاوپێکەوتنەکەم بڵاوکردەوە، چ بە دەمیی و چ بە نامە، ئاگاداریانکردمەوە، گوایە: گەر بهاتایە، لە پەراوێزی وەڵامەکانی مامۆستادا، تێبینیی و کۆمێنتاریی خۆم، لە سەر دید و بۆچوونەکانی بنووسیایە، چاوپێکەوتنەکە، گەلێ دەوڵەمەندتر و باشتردەبوو. بەڵام، من لەوە پەشیمان نیم، کە ئەو کارەم نەکردووە. چونکە، بە ڕاستم نەزانیوە و ئێستەش، هەر بە ڕاستی نازانم. لەبەرئەوەی، ئەرکی سەر شانی من، وەک کەسێ، چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ مامۆستادا کردبێ، تەنیا هەر پرسیارکردن بووە. ئەویش، خۆی ئازادبووە، لەوەی چی وەڵامداوەتەوە. وا بزانم، ئەوەش مافێکی ڕەوا و سرووشتیی خۆی بووە، گەر ئێمە، باوەڕمان بە پچووکترین مافی مرۆڤ و سەرەتاکانی دیمۆکراسیی هەبێ! بەڵام، لە بەرهەمی « ناکۆکیی و ناپاکیی لە مێژووی کورددا »، وەک سەرچاوەیەک بەکارمهێناوە، زۆر بە درێژیی، لە بۆچوونەکانی مامۆستا دراوم و باوەڕی خۆم دەربڕیوە. خوا یاربێ، لە هەلێکدا چاپیدەکەم.
4. هەر وەک، لە بەرهەمی « سەلیقەی زمانەوانیی »شدا، باسمکردووە، زمان، وەک هەموو بوونەوەرێکی زیندووی دیکەی ئەم گەردوونە وایە، پێبەپێی گۆڕانکارییە « نەتەوەیی، ڕامیاریی، ئابووریی، زانستیی، کۆمەڵایەتیی و کەلتووریی »یەکان، گەشەدەکا و پێشدەکەوێ. ئەو گەشەکردن و پێشکەوتنەش، لە هەموو بوارەکانی زماندا ڕوودەدا.
لەبەرئەوە، ئەم چاپە نوێیە، لەگەڵ هەر دوو چاپەکەی دیکەی پێشوودا، تەنیا لە ڕووی « ڕێنووس، جۆری پیت، قەبارەی پیت و ژمارەی لاپەڕە »کانەوە،

جیاوازییـان هەیە. ئەگینا، ناوەڕۆکەکەی هەر ئەوەیە، لە چاپی یەکەم و دووەمدا بڵاومکردۆتەوە، بێ ئەوەی، هیـچی لێ کـەم و زیادکـرابێ، چونکە، کـاتی خـۆی هیـچم لێ نەپەڕاندووە، تا ئەوڕۆ ئەم چاپەی پێ قـەبەترکـەم. بەڵام، لە کـۆتایی بەرهەمـەکـەدا، دوو گـوتاری دیکەم بڵاوکـردۆتەوە، پێـوەندییـیان بە مـامـۆسـتـا و چاوپێکەوتنەکەوە هەیە. یەکەمیان: ئەو گوتارەیە، بە ناوی « جاش یا باش »، لە لایەن « ڕێبـاز مـحـێـدین » ناوێکەوە بڵاوکراوەتەوە. دووەمـیـشـیـان: گـوتـارێکی خۆمە، بە بۆنەی کۆچیدوایی مامۆستاوە نووسیومە و بڵاومکردۆتەوە.
هەروەها، وەک بیستـوومە، لەو چاپانەی بێ پرسی من، لە کـوردستـان چاپ و بڵاو کراوەتەوە، هێندێ گۆڕانکاریی تێدا کـراوە. لەبەرئەوە، لێرەدا زۆر بە ڕاشکاویی دەڵێم: جگە لەم سێ چاپە بە گـشـتـیی و ئەم چاپەش بە تایبـەتیی، هیچ چاپێکی دیکە، بە بەرهەمی خۆم نازانم!
ئەوا، ئەم جـارەش، چاپی سێـیـەمی چاوپێکەوتنەکـە بڵاودەکـەمـەوە. هیـوادارم، کەڵکی هەبێ، ڕووناکبیر و نووسەرانی کورد، هەر چی دەزانن، هەر ڕاستییـیەکی « مێژوویی و ڕامیاریی »یان، لا چنگدەکەوێ، گەر پێوەندیی بەم باسانەوە هەبێ، با، چاویان قایمبێ و نەترسن، لە سەری بنووسن و بڵاویکەنەوە، تا هەمووشتێ، بۆ جـەمـاوەری خـوێنەری کـورد ڕوونبـێـتـەوە. بێ ئەوەی، گـوێ بە سرتە و بۆڵەی هیچ کـەس و هیچ لایەنێ بدەن، یا، ڕاسـتـیی لە جـەمـاوەر بشـارنەوە. چونکە، جگە لەوەی، عـەرەب گـوتوویەتی: « ئەوەی لە ئاسـتی ڕاسـتـیـیـدا بێ دەنگبێ، ئەهریمەنێکی لاڵە! » منیش دەڵێم: ئەوەی ڕاستـیش لنگەوقـووچکا، ئەو مـرۆڤـە، مرۆڤـێکی ئازا و ئازاد، سەربەست و سەربەخۆ نییە، هەرگـیز ناشـتوانێ، ڕاژەی نەتەوە و نیشتمانەکەی خۆی بکا!
لە کۆتاییـشـدا دەڵێم: خوایە! تۆ خوایەکی هێندە گەورەی، وەک دەڵێن: ئاگـات لە خشپەی پێی مار و مێروو هەیە، هەڵبـەتە دەبێ، ئاگاشت لە چرکەی کاژێری دڵە پچکۆلانەکـەم و دەزوولەی داوە باریکەکـانی بیـر و هۆشی مـنیش هەبێ، گـەر، هەمـوو ئامـانج و مـەبەسـتـێکم، تەنیـا هەر، ڕاژەکـردنی « ڕاسـتـیی، مـێـژوو و کەلتووری » نەتەوەکەم نەبێ، ئەوا، لە هیچ کارێکدا، سەرکەوتووم نەکەی!

دوکتۆر حوسێن محەمەد عەزیز
ستۆکهۆڵم
2001/12/01

## پێشـــەکیی چاپی دووەم

ئەوەتەی، چاپی یەکــەمی ئەم بەرهەمــە بڵاوبۆتەوە و دەس خــوێنەرانی هێــژای نەتەوەکـەم کـەوتووە، پەیتـا پەیتـا، لە کـوردسـتـانەوە، بە نامـە داوایدەکەن. بە تایبەتیی، کاتێ، لە « 1996/05/03 »دا، بۆ جاری چوارەم، سەردانێکی کورتی وولاتم کرد، چاوم بە هێندێ، لە ڕۆشنبیر و خوێنەوارانی گەلەکەم کەوت، یا، بە تێلێفۆن، قسەم لەگەڵ هێندێکی دیکەیاندا کرد. داوای، سەرجەمی بەرهەمەکانیان لێ کردم. بە تایبەتیی، ئەم چاوپێکەوتنەی، لەگەڵ مامۆستا « برایم »دا سازمکرد بوو.
لەبەرئەوەی، ئەو بەرهەمـانەی، لە هەندەران چاپدەکرێن، لە لایەکـەوە، جگە لە ژمـارەیەکی کـەم نەبێ، ئەوەندەیان لێ ناگاتەوە کـوردسـتـان، تا دەس خـوێندەواران بکەون، ڕێگەوبانیش، هێندە خۆش نییە، تا، هەر کاتێ، مرۆڤ ویستی و چەندی بوێ، ڕەوانەی کوردستـانیـان بکاتەوە و بە ئاسانیی، دەس خوێنەواران بکەون. لە لایەکی دیکەشەوە، هەمـوو ئەو بەرهەمـانەی، لە هەندەران چاپدەکرێن، تەنیـا، بۆ کــوردە پەنابەرەکــانی، پەڕیدەی هەندەران نین. بەڵـکوو، بۆ هەمــوو، ڕۆڵەکــانی نەتەوەی کـوردن. جـا، گـەر ژمـارەیەکی زۆریان، بەر دەس خـوێنەوارانی گـەلەکـەم نەخـرێن، ئەوا، بە دڵنیـاییـیــەوە دەڵێم: هیچ کـەڵکێکیـان نابێ! بۆیە، زۆر بە پێویستم زانی، بەگوێرەی توانا هەوڵبدەم، جارێکی دیکە لە کوردستان، سەرجەمی بەرهەمـەکـانم، بە چاپبگەیەنمەوە، تا، خـوێندەوارانی نەتەوەکـەم، کـەڵکیـان لێ وەرگرن.
لێرەدا دەمەوێ، شتێ بڵێم. کاتێ، لە کوردستان بووم، ئێوارەی ڕۆژی « 23/مای/ 1996 » بە هۆی برایانی « سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستـراتیجی کـوردستـان »ەوە، بەرنامەیەکی ڕاستەوخۆمان، لە سەر « بزووتنەوەی ڕووناکبیـریی، ڕۆڵی ڕێکخراوە دێمۆکراسییەکان و کێشەی پەنابەر »، لە تێلێفیـزیۆنی « گەلی کوردستـان »ەوە،

پێشکەش بە بینەرانی هێژای شاری « سولەیمانیی » کرد. هاوولاتیانی شارەکەم، بە تیلتیفۆن، گەلێ پرسیاری جۆراوجۆریان ئاراستەکردم. یەکێ لەو پرسیارانە، ئەوەبوو، ئایا، بۆچی کوردە پەنابەرە نووسەر و ڕووناکبیرەکان، لە هەندەران، هەوڵی چەسپاندنی، ڕێنووسێکی یەکگرتووی کوردیی نادەن؟ هەر چەندە، لە وەڵامدا گوتم: ئەم کارە، پتر لە ناوەوەی وولات و لە لایەن، « کۆڕێکی ئەکادیمیی کوردیی »یەوە دێتەدی. بەڵام، لێرەدا، بەگوێرەی توانای خۆم، هەوڵدەدەم، لەو بارەیەوە، شتێ، دەربارەی ڕێنووسی یەکگرتووی کوردیی نوێ، ڕوونکەمەوە.

بە باوەڕی من، بۆ ئەوەی، یەک ڕێنووسی یەکگرتووی کوردیی، لە ڕۆژهەڵات و باشووری کوردستاندا پێڕەوکرێ،* پێشنیازدەکەم، بڕیار لە سەر، یەکێ لەم دوو شێوە ڕێنووسە بدرێ. هەر وەک، لە سەرەتاشدا گوتم: دوا بڕیاریش، هەر بۆ شارەزایانی، ئەو بوارە دەگەڕێتەوە.

1. چاوگی ووشەکان، پێکەوە بنووسرێ. کاتێکیش، ووشەکانی وردەکرێنەوە و وەک کردار بەکاردێنرێن، ڕەگەکانیان بە جیا بنووسرێن. بۆ نموونە:

ڕێککەوتن ـ ڕێک کەوتن، ڕێک کەوتوون، ڕێک دەکەوێ، ڕێک دەکەون.
دەربازبوون ـ دەرباز بوو، دەرباز بوون، دەرباز دەبێ، دەرباز دەبن.
پەلەکردن ـ پەلەی کرد، پەلەیان کرد، پەلە دەکا، پەلە دەکەن.
لێکۆڵینەوە ـ لێی کۆڵییەوە، لێیان کۆڵییەوە، لێی دەکۆڵێتەوە، لێی دەکۆڵنەوە.
حەزلێکردن ــ حەزی لێ کرد، حەزیان لێ کرد، حەزی لێ دەکا، حەزی لێ دەکەن.
پێووتن ــ پێی ووت، پێیان ووت، پێی دەڵێ، پێی دەڵێن.

2. هەر ووشەیەک، واتایەکی تایبەتیی بگەیەنێ، پێکەوە بنووسرێ. بۆ نموونە:

ڕێککەوتن ـ ڕێککەوتن، ڕێککەوتوون، ڕێکدەکەوێ، ڕێکدەکەون.
دەربازبوون ـ دەربازبوو، دەربازبوون، دەربازدەبێ، دەربازدەبن.
پەلەکردن ـ پەلەیکرد، پەلەیانکرد، پەلەدەکا، پەلەدەکەن.
لێکۆڵینەوە ـ لێیکۆڵییەوە، لێیانکۆڵییەوە، لێیدەکۆڵێتەوە، لێیدەکۆڵنەوە.
حەزلێکردن ــ حەزیلێکرد، حەزیانلێکرد، حەزیلێدەکا، حەزیلێدەکەن.
پێووتن ــ پێیووت، پێیانووت، پێیدەڵێ، پێیدەڵێن.

ئەمانە، چەن نموونەیەکی کەمبوون. بەڵام دەتوانین، لە سەر هەر یەکێ، لەو دوو شێوە ڕێنووسە، بە دەیان نموونەی دیکە بێنینەوە. جگە لەوەش، جوانتر وایە، لە کاتی نووسیندا، ئەو ووشانەی، بە دوو « ی » کۆتاییدێن، بە سەر یەکەوە بنووسرێن. وەک:

ئابووری ی ـ ئابووریی. ئابوورییەکان، نەک ئابووری یەکان.
نەتەوەی ی ـ نەتەوەیی، نەتەوەیی یەکان، نەک نەتەوەی یەکان.
دیمۆکراسی ی ـ دیمۆکراسیی، دیمۆکراسییەکان، نەک دیمۆکراسی ی ەکان.
هەروەها، بە هیچ شێوەیە، « ی » لە ووشە و ناو جیا نەکرێتەوە. بۆ نموونە:
قوتابخانەی گۆران ی سەراتای ی کچان ـ قوتابخانەی گۆرانی سەراتایی کچان.
ئەمانە، چەن نموونەیەکی کەمبوون،1* بۆ ڕێنووسێکی یەکگرتووی کوردیی، پێش چاوی خوێنەوارانی نەتەوەکەم خست. هیوادارم، زمانەوان و خوێنەوارانی نەتەوەکەم، لەو بارەیەوە، دەمەتەقێیەکی گەرمی لە سەر بکەن و یەکێ، لەو دوو ڕێنووسە هەڵبژێرن. چونکە، کاتی ئەوەمان هاتووە، زمانەکەمان، لەو پاشاگەردانییە ڕزگارکەین و بنچینەیەک، بۆ ڕێنووسێکی یەکگرتووی کوردیی دارێژین.
لە کۆتاییدا دەڵێم. لەم چاپەدا، پێڕەوی شێوە ڕێنووسی یەکەمم کردووە. هەڵەکانی چاپی یەکەمم، ڕاست کردۆتەوە. هیوادارم، چاپی دووەمی ئەم بەرهەمە، لە نێو دڵ و دەروونی خوێنەوارانی کورددا، جێیەکی تایبەتیی، بۆ خۆیی بکاتەوە، خوێنەواران و خەمخوارانی زمانی شیرینی کوردییش، بە وردیی، سەرنجی ڕێنووسەکەی بدەن و کەڵکی لێ وەرگرن.

دوکتۆر حوسێن محەممەد عەزیز
ستۆکهۆڵم
1996/06/06

تێبینیی:
* بۆیە، ئەو دوو پارچەیەی کوردستان دەسنیشاندەکەم و باسی، « باکوور و خۆراوا »ی کوردستان ناکەم، چونکە، لەو دوو بەشەدا، بە پیتی عەرەبیی دەنووسن و لە دوو بەشەکەی دیکەشدا، بە پیتی لاتینیی دەنووسن.
1* لە بەرهەمی « سەلیقەی زمانەوانیی و گرفتەکانی زمانی کوردیی »دا، زۆر بە دوورودرێژیی، لە زۆربەی ئەو باسانە دواوم.

# پێشـــەکیی چاپی یەکەم

دوای کـۆدەتاکـەی، چواردەی یولی « عـەبدولکەریم قـاسم »، منداڵیکی تەمـەن هەشت نۆ سـاڵان بووم، کـاتێ، بۆ یەکــەم جـار لە ژیانمدا، لە دەمی باوکم و مامەکانمەوە، نـاوی « برایم ئەحمەد »م بیست. ئەو کاتە، دەیانگووت: مامۆستا « برایم »، نووسەرێکی بلیـمەت، هۆنەرێکی هەڵکەوتوو، پۆلیتیکێکی زیرەک و بە توانایە.

لە تەمـەنی دوازدە سـاڵـیـدا، چیـرۆکی « کـوێرەوەری »م خـوێندەوە، بەڵام، وەک مێردمنداڵێکی پۆلی پێنجی سەرەتایی، هیچی لێ تێ نەگەیشتم، تا، جارێکی دیکە، لە ساڵەکانی حەفتادا خوێندمەوە.

ناو و ناوبانگی « برایم ئەحـمـەد »، لە نێـو نەوەی ئێـمـەدا، زیاتر، لە سـەرەتای ساڵەکانی شەستەوە دەنگیدایەوە. لە هەمـوو ژیانی خۆمدا، لە نزیکەوە « برایم ئەحمەد »م نەدیبوو، بەڵام، بەرهەمی نەبوو، نەمخوێندبێتەوە. زۆر حەزمدەکرد، لە نزیکەوە بیناسم و گوێ بۆ قسەکانی ڕادێرم.

لەو سەردانە کوورتەی، سەری ساڵی «1994 ـ 1995 »، بۆ « لەندەن » کردم، تا، هێندێ دۆست و برادەری ئازیز، بەسـەرکـەمـەوە، بە هەلـم زانی، ئەو ئاواتەی خۆم بەدیبـێـنم و ســـــەرێکی مـامـۆسـتـا « برایم »یش بدەم. بە هۆی هاورێی خۆشەویستم « سەباحی غالبی »یەوە، ژمارەی تێلێفۆنەکەیم وەرگرت، تێلێفۆنم بۆ کـرد و خۆمم پێ ناسـاند. لە سـەر ئەوە ڕێککەوتین، لە « مەڵبەندی ڕۆشنبیـریی کوردیی » لە « لەندەن »، کاژێری دووی پاش نیـوەڕۆی ڕۆژی «1994/12/31 »، چاومان بە یەکدی بکەوێ.

لەو ڕۆژەشـدا، کـۆڕێ لە لایەن « دوکـتـۆر مـەحـموود عـوسـمـان، دوکـتـۆر نووریی تاڵەباتیی، دوکتۆر کەمال میراودەلیی و کاک حەمە ڕەسوڵ هاوار »ەوە، دەربارەی

بارودۆخی « باشووری کوردستان » و ئەو جەنگە نێوخۆییە ماڵوێرانکەرانەی نێوان « پارتی ویەکێتی » دەگیرا، کە هەر دووکمان، بۆ ئەو کۆڕە بانگکرابووین. لەوێ، بۆ یەکەم جار، یەکدیمان بینی.
بەڵام، لە لایەکەوە، لە بەر دووروودرێژیی دەمەتەقێکان و گیروگرفتی بەشدارانی کۆڕ، لە لایەکی دیکەشەوە، بە هۆی ئەوەی، شەوی سەری ساڵ بوو، خەڵکی، لەگەڵ منداڵ و کەسوکار و دۆستەکانی خۆیاندا، سەرقاڵی پێشوازیکردنی جێژنی سەری ساڵی تازە بوون، نەمانتوانی، وتووێژەکەمان دەسپێبکەین. ناچار بڕیارمان دا، دوای جێژن، یەکدی ئاگادارکەینەوە و کاتێکی گونجاو، بۆ هەر دوو لامان دانێین، تا، چاوپێکەوتنەکە بە ئەنجامبگەیەنین.
ڕۆژی «1995/1/3»کاژێری یەک، لەگەڵ « ئاوات »ی هاوسەرما، بە کۆمەڵێ بیر و ئەندیشە و پرسیارەوە، بە کامێرایەک و ڕیکۆردەرێکەوە، بەرەو ماڵی « برایم ئەحمەد »کەوتینەڕێ. هەر چەندە، ماڵەکەیان زۆر دووربوو، بەڵام، ئێمە لە کاتی خۆیدا و کاژێری دووی ڕێک، لە دەرگامان دا. کاک « برایم » چاوەڕێیدەکردین، سەیرێکی کاتژمێرەکەی کرد و گوتی: بە ڕاستیی، ئێوە چاک هاتن، هەر چی دێ بۆ لام، قەد لە کاتی خۆیدا ناگا. هەر لەوێ، چاومان بە هونەرمەندی دەنگخۆشی ناوداری کورد « مەزهەری خالقیی »کەوت. دوایی، هەر ئەوەندەی کەمێ دانیشتین و سەرو پیاڵە چامانخواردەوە، ئیدی، یەکسەر بەبێ پێشەکیی و خۆناساندن بە یەکدی، چوینە نێو باسەکەوە و دەسمان بە کارکردنکرد. من پرسیارم لێ دەکرد و خەریکی تۆمارکردنی وەڵامەکانی کاک « برایم » بووم، « ئاوات »یش، جاروبار، لە کاتی پرسیار و وەڵامەکاندا، وێنەیەکی کاک « برایم »ی دەگرت. ئەویش، بەگوێرەی پرسیارەکان، شەن و کەوی بیرەوەرییەکانی خۆی دەکرد.
بەو شێوەیە، یەک لە دوای یەک، هەموو پرسیارەکانم ئاراستەکرد، بێ ئەوەی، هیچمان پشوویەکبدەین، یا تاقەتمانبچێ، یا ماندووبین. وەکوو دەڵێن: قسەقسە دێنێ، ئێمەش، وامان لێ بەسەرهاتبوو، هەر پرسیاربوو، پرسیارێکی دیکەی، بە دوای خۆیدا ڕادەکێشا. بۆیە، لە کاژێری دووی پاش نیوەڕۆوە، تا، حەوتی سەر لە ئێوارە، سیویەک پرسیاری سەرەکییم ئاراستەکرد، واتە: ماوەی پێنج کاژێری تەواو، بە پرسیارکردن و وەڵامدانەوەوە خەریکبووین. هەر لەبەرئەوەش بوو، ئەم نامیلکە خنجیلانەیەم، بە ناوی « پێنج کاتژمێر لەگەڵ برایم ئەحمەددا » ناونا.
کەم کورد هەیە، ناو و ناوبانگی « برایم ئەحمەد »ی نووسەر، هۆنەر و چیرۆکنووسی، بەر گوێ نەکەوتبێ. کەم کورد هەیە، شتێ، دەربارەی ڕۆڵی گرنگی

ڕامیاریی « برایم ئەحمەد » ، لە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلەکەمان لە باشووری کوردستاندا نەزانێ، کەم کورد هەیە، هۆنراوەی « دوا تیری کەوان » و « شیرین بەهارە »ی نەبیستبێ. چیرۆکە کورتەکانی «کوێرەوەری » و ڕۆمانی « ژانی گەل » و « دڕک و گوڵ »ی نەخوێندبێتەوە.
من، لێرەدا نامەوێ، « برایم ئەحمەد » ، بە خوێنەوارانی کورد بناسێنم، چونکە، ئەو خۆی، لای هەمووان ناسراوە. بەڵام، « برایم ئەحمەد » ، یەکێکە لەو پیاوە ڕووناکبیرانەی کورد، کە لە سەرەتای سییەکانەوە، خۆی بە « نووسین و کاری ڕامیاریی »یەوە خەریککردووە. لە سەردەمی گۆڤارە ئازیزەکەی «گەلاوێژ »دا، ڕۆڵێکی گەلێ گرنگی، لە داهێنان و بوژاندنەوەی زمانی کوردییدا وازییکردووە. لە بواری ڕامیارییشدا، لە سەرەتای چلەکاندا، یەکەم لێپرسراوی لقی « ژ.ک. »ی شاری « سولەیمانیی » بووە. لە ڕیزەکانی « پارتی دیموکراتی کوردستان »یشدا، هەر لە سەرەتاوە، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی « پارتیی » بووە. تا، لە سەرەتای شەستەکاندا و لە کۆنگرەی « پێنج »دا، بە سکرتێری « پارتیی » هەڵبژێرراوە.
دەربارەی، هەموو ئەو دووبەرەکییانەی، لە نێو ڕیزەکانی « پارتیی »دا ڕوویان داوە، هەر لە سەرەتاوە، تا، دووبەرەکییەکەی ساڵی «1964 » ، ئاگادارییەکی تەواویی هەیە. کاتێ، دووبەرەکییەکەش، لە نێو ڕیزەکانی « پارتیی »دا دروسبوو، « برایم ئەحمەد » ، دژی سەرکردایەتی « بارزانیی » ، ڕێبەرایەتیی باڵەکەی « پەلیتبیرۆی » دەکرد. دوای ڕێککەوتننامەی «11/مارس/1970 »ش کاتێ، ڕیزەکانی « پارتیی » یەکیانگرتەوە، « برایم ئەحمەد » تا، دوارۆژە ڕەشەکانی شۆڕشی «11/ سێپتێمبەر» هەر لە نێو شۆڕش و لە نزیک بارەگای سەرکردایەتی شۆڕش بوو.
لەبەرئەوەی، « برایم ئەحمەد » خۆی، ڕاستەوخۆ، بە یەکێ لە سەرکردەکانی، ئەو « دووبەرەکیی و ناکۆکیی »یەی، نێوان ڕیزەکانی « پارتیی » دادەنرێ، وەک سکرتێری باڵەکەی « پەلیتبیرۆ »ش، سەرکردایەتی ئەو کۆمەڵەی کردووە، دەسێکی باڵاشی، لە کێشەکانی شەڕ و ئاشتییدا هەبووە، یەکێکە لەو کوردانەی ئەوڕۆ ماوە و زۆر بە وردیی، ئاگای لە هەموو هۆکانی ناکۆکیی و دووبەرەکییەکە هەیە، بۆیە، بە پێویستم زانی، لەو ڕووەوە، چاوپێکەوتنێکی لەگەڵدا سازکەم. چونکە، لە لایەکەوە، تاکوو ئێستە، بە دووروودرێژی، هۆکانی ئەو دووبەرەکییە، ڕوون نەکراونەتەوە. لە لایەکی دیکەشەوە، ئەو ناکۆکیی و دووبەرەکییە، تاکوو ئەوڕۆش، هەر بەردەوامە. ماوەی سێ ساڵێکیش دەبێ، بە دوای هەموو دەنگوباس

و هەواڵیکی، هەموو ئەو « ناکۆکیی، دووبەرەکیی و ناپاکیی »یانەی، لە مێژووی نەتەوەی کورددا ڕوویانداوە، ویلّم و سەرچاوە کۆدەکەمەوە، تا، لە دواڕۆژدا بتوانم، لێکۆڵینەوەیەکی بابەتانە و زانستانە، لەو بارەیەوە، پێشکەش بە ڕۆڵەکانی نەتەوەکەم بکەم، بە تایبەتیی، شۆڕشی چوارده ساڵەی «11/سێپتێمبەر »ی باشووری کوردستان، شوێنێکی گەورەی، لەو لێکۆڵینەوەیەدا بۆ خۆی داگیر کردووە.
بۆیە، زۆر بە پێویستم زانی، پێشەکیی، دەربارەی ئەو ناکۆکیی و دووبەرەکییەی، شۆڕشی «11/سێپتێمبەر »، ئەم چاوپێکەوتنەی « برایم ئەحمەد »، وەک بەرکولێ لەو کارە، پێشکەش بە خوێنەواران و ڕۆشنبیرانی هێژای، گەلەکەم بکەم. بەڵکوو، هەر دوو لامان، لە ڕێی ئەو پرسیار و وەڵامانەوە توانیبێتمان، هێندێ لەو گرێ کوێرانەی، ڕووداوەکانی شۆڕشی « سێپتێمبەر »، بۆ ڕۆڵەکانی گەلەکەمان و نەوەکانی داهاتوومان ڕوونکەینەوە و پەردە، لە سەر هێندێ‌لە نهێنییەکانی، ئەو دووبەرەکییانەی ڕیزەکانی نێوخۆی، « پارتی دیموکراتی کوردستان » و گەلی کوردمان هەڵدەینەوە.
مەرج نییە، نووسەری ئەم نامیلکەیە، لەگەڵ هەموو باری سەرنج و بۆچوونەکانی مامۆستا« برایم »دا بێ. هەموو ئەو وەڵامانە، تەنیاوتەنیا، بیروڕای تایبەتیی خۆیەتی. بەڵام، لێرەدا بە پێویستی نازانم، باسی هەموو بیروباوەڕ و بۆچوونەکانی مامۆستا « برایم »تان بۆ بکەم، پەنجە بۆ لایەنی ڕاست و هەڵەی بۆچوونەکانی ڕاکێشم و شیانکەمەوە و بە چاوی ڕەخنە سەیریانکەم. بەڵکوو، ئەو کارە، بۆ کاتێکی دیکە جێدێڵین. بەڵام، گەر خوێنەری زیت و وریا، کەمێ بە وردیی، سەرنجی وەڵامەکانی بدا، لەگەڵ ئەو نووسینانەی پێشوو، کە لە سەر دووبەرەکییەکە نووسراون، یا، لەگەڵ ئەو چاوپێکەوتنەی، کە لەگەڵ تێلێڤیزیۆنی «مەد »دا کردی، بەراوردیانکا، زۆر شتی بۆ ڕووندەبێتەوە و لە هەموو مەبەسەکان دەگا.
پێش ئەوەی، ئەم نامیلکەیەش بە چاپبگەیەنم، بە پێویستم زانی، بە نامەیە مامۆستا « برایم ئەحمەد » بەسەرکەمەوە، هێندێ پرسیاری دیکەی، دەربارەی ژیانی تایبەتیی خۆی لێ بکەم. داواشم لێ کرد، دەربارەی چۆنیتی بڵاوکردنەوەی نامیلکەکە، بیروڕای تایبەتیی خۆیم بۆ بنووسێ. بەڵام بە داخەوە، بێ ئەوەی، هیچ هۆیەکی دیاریکراو هەبێ، تا ئێستە، وەڵامی نامەکەی نەداوەتەوە. منیش، لە بەر بایەخی باسەکان، ناچاربووم، بڕیاربدەم، چی دیکە، چاوەڕوانی وەڵامی

نامەکەم نەکەم و بڵاوکردنەوەی نامیلکەکەش، لەوە زیاتر دوا نەخەم. پرسیار و وەڵامەکان، وەکوو خۆی، چۆن هەیە، هەر بەو شێوەیە، بڵاویانکەمەوە، دوای ئەوەی، هەموو ئەو وەڵامانەی، دووبارەکراونەتەوە، بیانقرتێنم و سەرلەنوێ، ڕێکیانخەمەوە و بە شێوەیەکی ڕەوانتر و جوانتر، وەڵامی پرسیارەکانی دابڕێژمەوە، بێ ئەوەی، لەگەڵ ناوەڕۆکی مەبەسەکە و بۆچوونەکانیدا جیاوازییان هەبێ.
لە کۆتاییدا دەڵێم: بریا مامۆستا « برایم » ، کەمێ گورجوگۆڵ و چالاک بووایە، لە دوای « دڕک و گوڵ »ەوە، چاو و دڵێ بە بەرهەمی نوێی دیکە ڕۆشنکردینایەتەوە.

حوسێن محەمەد عەزیز
ستۆکهۆڵم
1995/7/14

پ1: پێموایە، سەرەتا دەبێ، سەر بە کۆشی مێژوودا بکەین. بێ گومان، بەڕێزتان، یەکێ لەو کەسانە بوون، بەرپرسیاری لقی « سولەیمانیی ـ ژ. ک »تان، لە ئەستۆ گرتبوو. لەو کاتانەشدا، « پارتی ڕزگاریی و شۆڕش » هەبوون، ڕۆشنبیران و کوردپەروەران ویستیان « پارتی دیموکراتی کورد » دامەزرێنن. بەڵام، بەڕێزتان، هەر لە سەرەتاوە، ناڕازییبوون. یەکەم جار، لەگەڵیان تێکەڵ نەبوون. دواتر، لقی « ژ. ک. »تان هەڵوەشاندەوە و لەگەڵ « پارتیی »دا تێکەڵبوون. لە کاتی کارکردنتاندا، وەک ئەندامێکی سەرکردایەتی « پارتیی »، لەگەڵ کاک « هەمزە عەبدوڵلا »دا، تووشی ناکۆکییەک بوون، وا بزانم، ئەو ناکۆکییە، لە ساڵی «1951 یا 1952»دا ڕوویدا. بەڕێزتان، لەو بارەیەوە دەتوانن، بە کورتیی، هۆکانی ئەو ناکۆکییەمان، بۆ ڕوونکەنەوە؟

و1: پێویست بەوە ناکا، لێرەدا، باسی ئەوە بکەم، کاتێ، « پارتی دیموکراتی کوردستان » دروسکرا، چ جۆرە پێوەندییەکم، لەگەڵ « پارتیی »دا، یا، لەگەڵ « ژ. ک. »دا هەبوو. دێینە سەر ئەوەی، کاتێ، کۆماری « مهاباد »، هەرەسی پێ هێنرا و « حیزبی دیموکراتی کوردستان » نەما، ئێمە ناچار بووین، وەک لقێکی « ژ. ک. » لە پێشدا و وەک « حیزبی دیموکراتی کوردستان » لە دواییدا، بڕیارێ بدەین و بچینە لایەک. بە باشمان نەزانی، بە تەنیا بمێنینەوە، تا، لەو پارتانەی ئەو سەردەمە، لە « عێراق »دا هەبوون، دوورە پارێز ڕا نەوەستین. لەو کاتەدا، لای ئێمە، دوو پارت لە گۆڕەپانەکەدا هەبوو، بۆ ئەوەی، یەکێکیان لێ هەڵبژێرین. یەکەمیان: « پارتی دیموکراتی کورد» بوو. دووەمیان: « پارتی کۆمۆنیستی عێراق » بوو. لە کۆبوونەوەکەدا، هەر چۆنێ بوو، بە زۆربەی دەنگ، بڕیاردرا، لەگەڵ « پارتیی » یەکگرین.
بەڵێ. چوینە لای « پارتیی » و کردیانم، بە لێپرسراوی ڕێکخراوەکەیان لە « سولەیمانیی ». دوای ئەوە، ئەمنی « عێراق »، دەسیانکرد بە گرتنی خەڵک. کۆمەڵێ خەڵکیان گرت. منیش، یەکێ بووم لەو کەسانەی، لە «17/ ئەپرێلی/1949 »دا گیرام. منیان، ڕەوانەی « بەغا » کرد. لەوێ، لە دایرەیەک، پێیاندەوت: « تەحقیقاتی جینائیی »، چەند ڕۆژێ لەوێ مامەوە. ئەوە دوور و درێژە، پێویست بە باسکردن ناکا. لە پاشان، ناردیانین بۆ ئەبو « غرێب » و دایانین بە دادگە. ئێمە، « 60 ــ 70 » کەس بووین، پێکەوە درابووین بە

دادگە. دۆسییەکەی من، یەک لاپەڕەی تێدابوو، کە باسی من بکا. من کێم و بە قسەی خۆیان، من لەگەڵ کاری ڕامیاریی خەریکم. لە هەموو ئەو شایەتانەی، هێنابوویانن، هیچ شایەتێکیان، لە سەر من نەبوو، تەنیا، شایەتێ نەبێ، ئەویش کوڕێکی کۆمۆنیستی کورد بوو، کە لە من و « شێخ لەتیفی شێخ مەحموود » و لە « پارتیی »شەوە نزیکبوو، ناوی« ڕەفیق چالاک » بوو. ئەو کاتە، ئەندامی جێگری کۆمیتەی ناوەندیی « پارتی کۆمۆنیستی عێراق » بوو. ئەو، تەنیا شایەتبوو. هاتەپێشەوە و ووتی: لای « برایم ئەحمەد» دانیشتبووم، دەمانخواردەوە. دووبەدووبووین، چاوەڕوانی « شێخ لەتیفی شێخ مەحموود »مان دەکرد. جا، ئەم خۆی، زۆر لەو نزیکدەکردەوە.
لەو شەوەدا، کە پەلاماری کۆماری « ئازربایجان » درا، لە کاتێکدا، « تەباتەبائیی » لە « تەبرێز »، هەواڵی بڵاودەکردەوە، کەوا، « شا » پێویست ناکا، لەشکر بنێرێ، ئێمە، کۆمۆنیستەکانمان بەزاندووە و شکاندووە. تەنیا، « والی »یە، « ستاندارد »ێ، شتێ دابنێ بۆ ئێرە، بەسمانە. تەماشامکرد، « برایم » خەریکە دەگری، ووتم: ئەوە چییە؟ ووتی: وەڵڵایی، بە ساوایی حوکوومەتەکەمان لەبارچوو، بەبێ ئەوەی، هیچ شتێکی واش ڕوویدابێ. ووتی: ئێنجا، ئەم پیاوە، بە تەمای ئەوەبوو، ئەو پارەیەی، کە بە کوڕەکەی « شێخ تەها » گیرابوو، چارەکە میلیۆنێ دینار بوو، تەمەن بوو، نازانم چی بوو. ئەمە، هاتبوو بۆ ئەم، تا، « کوردستانی « عێراق »ی، پێ تووشی شەڕ بکا. « کوردستانی عێراق »، بخەنە سەر « کوردستانی ئێران » و کۆماری « مهاباد » بەهێزکرێ. ئەمە، تەنیا شایەتبوو. لە سەر ئەم شایەتییەی « ڕفیق چالاک »، کە گوایە، من ئەندامی « پارتی کۆمۆنیستی عێراق »م، بە دوو ساڵ گرتن و دوو ساڵیش، کارکردنی قورس حوکمدرام.
ـ بە مەرجێ، ئەو کاتە، لە « پارتیی »دا کارتدەکرد و هەرگیز کۆمۆنیستیش نەبووی!
بەڵێ، بەڵێ. لە « پارتیی »دا، لێپرسراوی [illegible]لەیمانیی » بووم.
حوکوومەت، ئیشەکەی وابوو. من چوومە گرتووخانەوە. بێ گومان، لەو کاتەدا، چالاکیی لە « پارتیی »دا، بەرەبەرە، کزدەبوو. زۆر لە ئەندامەکانی سەرکردایەتیی گیرابوون، وەک « عومەر دەبابە ». هەروەها، دوو سێ ئەندامی دیکە، لە « پارتیی » دەرکرابوون، براکەی « حەبیب »،
ـ دوکتۆر « جەعفەر عەبدولکەریم ».

دەرکرابوو، دوورخرابۆوە، نێردرابوو بۆ « ئێران »، ئێدی، لەوانەی هەبوون، دەبوو « هەمزە عەبدوڵڵا »، چالاکیی بنوێنێ. « هەمزە عەبدوڵڵا »ش، چالاکییەکی ئەوتۆی نەبوو، گیرابوو، لە پاش گرتنەکەشی، بەردرابوو، دیسان نەیتوانیبوو، شتێ بکا. هیچ شتێکی نەکردبوو. خەڵکەکە، گلەییەکی زۆریان لێی هەبوو. پەیتاپەیتا، دەهاتن بۆ لای ئێمە بۆ گرتووخانە، باسی ئەوەیان دەکرد، چی بکەن و چی نەکەن، هەتا بوون بە دوو پارچەوە. تا ئەو کاتە، من چ ناکۆکییەکم، لەگەڵ « هەمزە عەبدوڵڵا »دا نەبوو.
ـ ببورە، مامۆستا، ئەوە ساڵی چەند بوو؟
ساڵی « 50 » بۆ « 51 » بوو. من، لە گرتووخانە بووم، هیچ شتێکمان لە نێواندا نەبوو، ئەشم دیبوو. چونکە، هێندێ جار، خۆی دەشاردەوە، هێندێ جاریش، دەردەکەوت. بەڵام، هیچ جۆرە چالاکییەکی رامیاریی ئەوتۆی نەبوو. برادەران، گلەییان زۆر لێی هەبوو. ئەویش، خۆی رەگەزنامەکەی لێ سەندرا بۆوە، بڕوای زۆر، بە حوکوومەت نەدەکرد. گەر چی، بە هیچیشیان دانەنابوو، بەڵام، دەترسا لەوەی، بگیرێ، لەبەرئەوە، ئەمدەبینی.
من، لە رۆژی «11/ مارسی/51 »دا بەربووم، بڕیارماندا، رۆژی « 12، 13 »، لە « بەغدا »، کۆبوونەوەی خۆمان بکەین. چونکە، بڕیاری حوکمەکە، دوو ساڵ چاودێریی پۆلیسیشی تێدابوو. دوای ئەوە نەمدەزانی، بۆ کوێم دەنێرن. لەوانەیە، من بۆ شوێنێ بنێرن، ئەوان نەتوانن، بێن و بمبینن. منیش، وەک یەکێ لەوانەی، پێکەوە کۆدەبووینەوە و قسەیەک لە ئیشەکە بکەین، بەو پێیە بڕیارماندا، لە « بەغدا » کۆبینەوە. کۆبوونەوەیەکمان، لە ماڵی شەهید « عەلی حەمدیی » کرد. لەوێ، باسی ئەو شتانە کرا، گلەییەکی زۆر، لە سەر کاک « هەمزە » هەبوو، کەوا، « هەمزە عەبدوڵڵا »، بە ئەرکی سەر شانی خۆی هەڵ نەساوە. کاری خۆی، بەجێ نەهێناوە و پارت لە فەوتاندایە. بۆیە، هەر لەوێ، لیژنەیەکی تازەمان، بۆ کۆمیتەی ناوەندیی هەڵبژارد. ووتمان: با، سکرتێری نەبێ. بەڵام، من لێپرسراوی یەکەمی، ئەو لیژنەیە بووم.
ئەم لیژنەیە، ئیشی چی بوو؟ ئەم لیژنەیە، پێویستبوو، لە ناتەواوییەکانی کۆمیتەی ناوەندیی پێشوو بکۆڵێتەوە، هەڵەکانی « هەمزە عەبدوڵڵا » و ئەوانی دیکە دەستنیشانکا. هەروەها، پرۆگرامێکی تازە، بۆ « پارتیی » دانێ، تا، بڕیاری کۆنگرێسی « پارتیی »، کە لە دواییدا دەگیرێ. « هەمزە عەبدوڵڵا » و برادەرانی دیکەی، دەستیان لە کار بکێشرێتەوە. لە مەوە، « هەمزە عەبدوڵڵا »

یاخیبوو، هەستیپێکرد، شتێ کراوە، بەرهەڵستییکرد و بلاقۆکێکی دەرکرد. گوایە: ئەو دەمڕاستی « مەلا مستەفا »یە، وەک دەڵێن: « الوكيل كالاصيل ». لەبەرئەوە، « مەلا مستەفا » نەبێ، کەس ناتوانێ، دەریکا! بوو بە قڕە و هەراوهوریا، بەڵام، کاک « هەمزە » نەیتوانی، ژمارەیەکی وا، بە لای خۆیدا داشکێنێ، تا بتوانن، چالاکییەکی لەبەرچاو بە ئەنجامبگەیەنن. لەبەرئەوە، لە ناچارییدا، خۆیان لە « پارتی کۆمۆنیست » نزیکخستەوە. هەر واشبوو، وەک لقێ لەوان کاریاندەکرد، نەک، ناوەکەی ئەوان وەرگرن، بەلکوو، ناوەکەی خۆیان هەر هێشتبۆوە، بە حسابی خۆیان، وەک « پارتیی » ئیشیاندەکرد، پێماندەوترا، باڵی ڕاست و باڵی چەپ. تەنانەت، ئەو ناکۆکییە، بۆ نێو ماڵەکانیشمان تەنییەوە. واتە: لە ماڵەکەشماندا، وای لێهات، خەسووم و خێزانەکەم، لای ئێمەیان گرت و لای « هەمزە »یان نەگرت. ناخۆشە، ئەمان بۆ لای « هەمزە » نەچوون، خێزانەکەی « هەمزە »ش، کە خوشکی من بوو، لەگەڵ « هەمزە » ڕۆیی، چی بکا؟ « هەمزە » دوورخرابۆوە، لە شارێکی دیکە دەژیا. نەیدەتوانی، بەنگبێ، ناکۆکییەکە، سەرەتاکەی ئاوا بوو.
کە ئەو دوورخرایەوە، منیان، بە بەرپرسیاری « پارتیی » دانا. وەک ئەو برایانەی دەیانووت و ئاگایان لێ بوو، ئەو دوو ساڵەی من گیرابووم، ئەو برادەرانەی دیکەش، هێندیکیان گیرابوون و هێندێکی دیکەشیان، دوورخرابوونەوە. هەموو ئیشوکارەکانی « پارتیی »، بە دەس کاک « هەمزە » و ئەوانەوە بوو. کەچیی، هیچ چالاکییەکی ئەوتۆیان نەبوو، کە لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوەشمان کرد، وا دەرکەوت، ڕاستدەکەن. ئەوان، خۆیان لێ بێ دەنگ کردووە و هیچیان نەکردووە. پاشان، ناوی ڕێکخراوەکەمان گۆڕیی، زۆر شتیشمان، لە پرۆگرامی « پارتیی » گۆڕیی.
شتێ هەیە، با لێرەدا باسیکەم، من خۆم، هەمیشە ئەو گلەییەم، لە برا کوردەکانم هەبووە. ئیشەکانی ئێمە، وەک ئیشی هەموو کوردێ، گەر یەکێ ئیشیکی گرتە ئەستۆ، ئیدی، ئەوانی دیکە، هەموو ئیشەکە، بە سەر ئەوا دەدەن. بۆ نموونە: شتێک بۆ دێنمەوە. ئێمە، لە « بەغدا » بووین، کوڕێ هەبوو، دراوسێمان بوو. لە ماڵی ئێمە، ئیشیدەکرد. ماڵەکەیان، « سەریفە »ی پێ دەوترا. « سەریفە » ئەوەیە، خانووەکانی لە قامیش دروسدەکرێ، لەوەدا بوو، منداڵێ بوو، جارویار دەهات، وردەوردە، شتێ دەهێنا، تا پارەی بدەینێ، ڕامگرت، ووتم: با، لە ماڵەکەماندا ئیشبکا، ناوی « عەبد » بوو. « عەبد »مان

ناردە قوتابخانە، شەو بخوێنێ، فێری خوێندنەوە و نووسین بوو. هێنامان، لە بارەگای « پارتیی »، تازە ڕۆژنـامەی « خەبات »مان دەردەهـێنا، وەک چاپچیی کاربکا. ڕۆژێ هات، بە منی ووت: فڵانە کەس، من ناتوانم، ئەم ئیشانە بکەم. ووتم: بۆ؟ ووتی: هـەرچی ئەدرێسـی ئابوونەکـانـی « خـەبات » هەیە، دەبێ، من بیاننووسم. ووتم: « عەبد »، لێمان ڕاوەستە، وازمان لێ مەهێنە، ئەوەندەی پێ ناچێ، ئەتکەین بە سەرنووسەر. هەر بە ڕاستیی، کورد ئەو تەمەڵییەی هەیە. ئیشەکە، بە سەر خەڵکی دیکەدا دەدا و لە کۆڵ خۆی دەکاتەوە. کاتی خۆشی، کە منیان هەڵبژارد و لێپرسراویان بووم، بە برادەرانی خۆم ووتووە: « هەمزە عـەبدوڵڵا »، لەبـەرئەوەی، دەربەدەربووە، برسـێتـیی و نەبوونیی دیووە. خـۆی شـاردۆتەوە، پێـویسـتـی بە پارە و دەسی ئەوان بووە. لەبەرئەوە، بە قـسـەی برادەرەکـانـی دەکـرد. ئەڵێن، خـۆهـەڵکێشـانـی تێـدایە، من، بە قـسـەی کـەس ناکـەم، من، بە پارەی خـۆم دەژیم، گـەر دەتـانەوێ، وەرن، لە چالاکـیـیـدا هاوکـارییبکەن، گەر نـایکەن، هەمـوو هەر قسـەدەکـەن و کار ناکـەن، بڵـێن: نایکەین. لەگەڵ ئـەوەشدا، کە بـەڵێنیـاندا، هەر کەسە بەجێیـهێشت بۆ ئەوی دیکە و ئیشـەکانیش، تەنیـا، بە سەر ملی مندا کەوت. لەبەرئەوە، پرۆگرامـــی « پارتیی »مان گۆڕیی. ناوەکەیمان کرد بە « پارتی دیموکـراتی کوردستان ».

ـ لە « پارتی دیموکراتی کورد »ەوە، بۆ « پارتی دیموکراتی کوردستان » ؟

بەڵێ. چونکە، کورد هیچ ناگرێتەوە. کۆمەڵێ دەگرێتـەوە لە کوردستـاندا، کە هەمـوو کوردن، هەمـوو کوردسـتـان کورد نییـە. لەبەرئەوە، خـەڵکمـان لێ دوور دەخـاتـەوە، بێـجگە لەوە، « کـۆمـۆنیـسـت »ەکـان، ناڕەزامـانبـوون، « پارتی دیموکـراتی کـورد »، واتایەکی نەتەوەیی تێدایە. لە کوردسـتـاندا، ئەو واتایە نییە، بە پیتی بۆرژوازیی تاوانبارمان ناکەن، کە هەست و هۆشی نەتەوەییمان هەیە.

بە کـورتییـیـەکـەی: لە سـەر ئەمـە دەسـتـپێکرد و هەر وا مـایەوە. بەڵام، لەو ماوەیەدا، دەنگێکی ئەوتـۆ و سەنگێکی ئەوتۆیان نەبوو. تا، « مام جـەلال »مان، وەک خوێندکارێکی لاو، نارد بۆ « مۆسکۆ »، بۆ ئەوەی بە ناوی « پارتیی »یەوە بەشداریی لە کۆنفرانسی لاواندا بکا. یەکێ لەو ئیشـانـەی، ئێمە پێمان سپارد بوو، ئەوەبوو، « مـەلا مسـتـەفا » ببینێ. ئەو چوو بۆ « مـۆسکۆ ». لەوێ، « مـەلا مستەفا »ی دیبوو. من یەکێ بووم لەو کەسـانەی، ناڕەزاییم هەبـــوو، لەوەی، « مەلا مستـەفا » لە دوورەوە سەرۆک بێ. چونکە، لەو باوەڕەدابووم و دەمووت:

« یەکێتی سۆڤێت »، پێوەندیی رامیاریی، لەگەڵ « عێراق »دا هەیە، کێ دەڵێ رازییە ، « مەلا مستەفا » سەرۆکی کورد بێ و ئێمە لە بنەوە، لە ووتارەکانماندا بنووسین، پاڵەوانی رزگاریی « کوردستان » و ئەویش، لە « مۆسکۆ » بێ؟ کێ دەڵێ، « مەلا مستەفا » خۆی، رازییە؟ کێ دەڵێ، دوای ئەوەی، ناوی « پارتیی »مان گۆڕیوە، سیستێمێکی نوێمان بۆ داناوە، شتێکمان بۆ کردووە، بووە بە پارتێکی بەهێز، تا بتوانێ، بەربەرەکانی« پارتی کۆمۆنیست » بکا. « مەلا مستەفا »، بەم هەموو گۆڕانکاریی و بەم پارتەی ئێستە رازییە؟ لەبەرئەوە، با، پرس بە « مەلا مستەفا » بکەین. بۆیە، راوەستاین، ئەندامەکانی دیکەشمان دەر نەکرد، وەک « شێخ عەزیز ».

ـ « شێخ عەزیزی شەمزینیی »؟

بەڵێ. « شێخ عەزیزی شەمزینیی ». وەک « مستەفا خۆشناو » و برادەرانی دیکەشمان لابردبوو.

ـ ئەو کاتە، « مستەفا خۆشناو » شەهیدکرابوو.

« مستەفا خۆشناو » نا. « مەلا مستەفا »، ئەوی هەڵ نەبژاردبوو. چونکە، ئەو دژی دامەزراندنی « پارتیی » بوو. لەگەڵ باوەڕی ئێمەدا بوو، کە « پارتیی » دروس نەکرێ. بە پێچەوانەوە، « پارتیی » ببێ بە « ژ. ک. ».

« مەلا مستەفا » بە « مام جەلال »دا، نامەی بۆ من نارد، لەگەڵ « هەمزە »دا یەککەوینەوە. ئێدی، « هەمزە » ئەو کاتە، خۆی و کۆمەڵێ کۆمۆنیست هاتنەوە ناو « پارتیی». ئێمە لادانێکی یاساییمان کردبوو، ناوی پارتەکەمان گۆڕیی بوو، بەبێ ئەوەی، کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندیی بکەین، کۆنفرانس، یا کۆنگریس بگرین. ئەگینا، گۆڕینی ناوەکە، بە دەس ئێمە نەبوو. بۆیە، جارێکی دیکە، ناوەکەمان گۆڕیی، بۆ « پارتی دیموکراتی کوردستانی یەککرتوو ». ئەوانیش، هاتنەوە ناومان. وەک « هەمزە عەبدوڵلا، نەژادی ئەحمەدی عەزیز ئاغا، عوسمان ئەحمەد »، ئەوی سکرتێری « پارتی کۆمۆنیست » بوو.

ـــ « حەمید عوسمان » ؟

کاک « کەمال فوواد و ساڵح حەیدەریی »، برایەکی دیکەشی هەبوو، نازانم، ناوەکەیم بیرچۆوە. بە کوورتیی: ئەمانە هەموو، سەر بە « پارتی کۆمۆنیست » بوون، هەموویان هاتنەوە ناو « پارتیی ». « پارتیی » کەوتەوەگەڕ و دەسی بە چالاکییەکانی خۆی کردەوە. ئەو ناکۆکییانە، لە ڕیزەکانی « پارتیی »دا نەما، تا هاتنەوەی « مەلا مستەفا »، جارێکی دیکە، سەریانهەڵدایەوە.

ـ گەڕانەوەی « بارزانیی »، بۆ پرسیاریکی دیکە هەڵدەگرین. بەڵام، ئەوەی دەمەوێ، لێرەدا بیزانم، ئەوەیە: وا دەردەکەوێ، ئەو ناکۆکییەی، لە نێوان بەڕێزتان و کاک « هەمزە »دا بووە. لە سەرەتادا، ناکۆکییەکی ئایدۆلۆژیی نەبووە. بەڵکوو، تەنیا هۆکەی، بۆ سستیی « هەمزە عەبدوڵڵا » دەگەڕێتەوە، چونکە، چالاکیی نەنواندووە. بەڵام، پاشان ناکۆکییەکە، بۆ کێشە و باسی ئایدۆلۆژیی گۆڕاوە. چونکە، ئێوە ناوی « پارتیی » و پرۆگرامەکەیتان گۆڕیوە، سەرلەنوێ گیانێکتان، بە بەر « پارتیی »دا کردۆتەوە. بەو شێوەیە، من نازانم، لە هێندێ سەرچاوەدا خوێندومەتەوە و بیستوشمە، کە « هەمزە عەبدوڵڵا » یەکێ بووە، لەوانەی « خالید بەگداش »، کاتی خۆی، پشگیرییکردووە، تا، بە سکرتێری « پارتیی » هەڵبژێرێ، ئایا شتی وا هەیە؟
هەرگیز، شتێ وا نییە. چ پێوەندییەکی، لەگەڵ ئەو باسەدا نییە. « هەمزە عەبدوڵڵا »، « مەلا مستەفا » خۆی لە « ئێران »ەوە ناردبووی، بە خۆی و نامەیەک و پرۆگرامێکی وەک « پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران »ەوە.
ـ مەبەستت ئەوەیە، لە سەر شێوەی پرۆگرامەکەی ئەوان بوو؟
بەڵێ. پرۆگرامێکی بێ سەر و بێ بن و هیچ بوو. پرۆگرامەکەی « ژ. ک. »، شتێکی زۆر بە نرختر و باشتربوو. بەڵام، پرۆگرامەکەی « دیموکرات » هیچ نەبوو.

پ2 : دوای ئەوەی، « بارزانیی »، لە « یەکێتی سۆڤێت » گەڕایەوە، کاک « هەمزە »، لە « پارتیی » دەرکرا و بەڕێزیشتان، بوون بە سکرتێر، ئایا، ئەو ناکۆکیی و دووبەرەکییەی، نێوان بەڕێزتان و « هەمزە عەبدوڵڵا »، لە سالی « 1952 »دا، چ جۆرە پێوەندییەکی، بەو ناکۆکییەی نێوان « بارزانیی » و کاک « هەمزە »وە هەبوو؟
و2 : هیچ جۆرە، پێوەندییەکی نەبوو. بە پێچەوانەوە، ئەو ناکۆکییە، لە نێوان « هەمزە عەبدووڵڵا » و « مەلا مستەفا » خۆیاندا، پەیدابوو. لە کاتێکدا، من وەک نوینەری « پارتیی » و گەلی کورد، لەگەڵ چەن نوێنەرێکی دیکەی « پارتی کۆمۆنیستی عێراق » و « حیزبی ئەلدیموقراتی ئەلوەتەنی »دا، « عەبدولکەریم قاسم » لە مانگی « مای/1959»دا، ناردینی بۆ سەرووی « ئەفریقا »، بۆ ئەوەی، بە دەوڵەتە « عەرەبیی »یەکاندا بگەڕێین و پڕوپاگەندە، بۆ شۆڕشی « عێراق » بکەین. ئێمە لەوێ بووین، بە هۆی هەواڵی رادیۆ و رۆژنامەکانەوە

بیستمان، جۆرە ناکۆکییەک، لە نێوان « عەبدولکەریم » و « پارتی کۆمۆنیست »دا پەیدابووە، هەرا و ئاژاوەیەک، لە نێوانیاندا ڕوویداوە. « مەلا مستەفا »، لایەنی « عەبدولکەریم » و « هەمزە عەبدوڵلا »ش، لایەنی « پارتی کۆمۆنیستی عێراق »ی گرتبوو. کاک « هەمزە »، بە « مەلا مستەفا »ی وتبوو: لایەنی « کۆمۆنیست »ەکان بگرێ. چونکە، « مۆسکۆ »یان لەگەڵە. جگە لەوەی، خوا دەزانێ، چیدیکەی پێ گوتبوو. دواتر، « هەمزە عەبدوڵلا »، نامەیەکی بۆ « مەلا مستەفا » ناردبوو، هەرچەندە، تاک ئێستەش نازانم، بە درێژیی، چی تێدا نووسرابوو. بەڵام، لە کۆتایی نامەکەدا نووسیبووی: « و قد کنت لک ناصحا الامین دوما ». بێ گومان، ئەمە خۆی لە خۆیدا، بۆ « مەلا مستەفا »ی دوای هاتنەوە، زۆر زۆر بوو. چونکە، ئەو هەموو ڕێزەی، لێ گیرا بوو، ئەو هەموو چەپڵەیەی، بۆ لێ درابوو، خەڵکێکی زۆر، بە پیرییەوە چوو بوون. بۆیە، نەک تەنیا « مەلا مستەفا »، بەڵکوو، بڕوا ناکەم، هیچ مرۆڤێکی دیکەش، پەسەندیکا، پێی بڵێ: « و قد کنت ... ». بۆیە، دەڵێم: « مەلا مستەفا » قەبووڵی نەدەکرد. چونکە، زۆر جار، ئەمەی دەوتەوە و بە گوێی ئێمەیدا دەدا، وەک ئەوەی بڵێ: منیش دەمەوێ، ئامۆژگارییتانبکەم!

جا، « هەمزە » ئەو نامەیەی بۆ نووسیبوو، لە سەر « عەبدولکەریم قاسم » و «کۆمۆنیست »ەکانیش، ناکۆکیی لە دید و بۆچوونەکانیاندا هەبوو. « مەلا مستەفا »، بۆیە لایەنی « مۆسکۆ »ی نەدەگرت و لایەنی « عەبدولکەریم »ی دەگرت، چونکە، بە حسابی خۆی، لایەنی « مۆسکۆ »ی مسۆگەرکردبوو، هەر وەک، لە سەرەتای کاریشدا، بە منی ووت: لایەنی « عەبدولکەریم » مسۆگەر نییە. « مۆسکۆ » مسۆگەرە. ئێمە هێشتا، هەر لە سەرووی « ئەفریقا » بووین، بە ڕادیۆ گوێم لێ بوو، ناکۆکیی لە نێوان « مەلا مستەفا و پارتیی »دا هەیە، کاتێ گەڕامەوە، زانیم، « مەلا مستەفا »، پەنجا تا شەست « بارزانیی » چەکداری، ناردۆتە سەر بارەگای « پارتیی ».

ـ لە کۆێ؟ لە « بەغدا »؟

بەڵێ. بۆ سەر بارەگای لقی پێنجی « پارتیی » لە « بەغدا ». هەموو برادەرەکانی دەرکردبوو، دەستی بە سەر بارەگاکەدا گرتبوو، هەر بە یەکجاریی، لە « پارتیی »ش دەریکردبوون. کاتێ، بەو هەراوهوریایەی، نێوان « مەلا مستەفا » و « هەمزە »م زانی، لە مانگی « یونی/1959 »دا، بە پەلە گەڕامەوە. کە هاتمەوە، بە پێچەوانەی ئەوەی ئەوان، چاوەڕوانیاندەکرد، داوام

لێ کردن، کۆبوونەوەیەک بکەین، یا، کۆنفرانسێ بگرین، تا، ئەم کارەی « مەلا مستەفا » کردوویەتی، ڕەتیکەینەوە و بە قسەی نەکەین. چونکە، ئەو مافی ئەوەی نییە ئەندام لە « پارتیی » دەرکا. بە تایبەتیی، مافی بەکارهێنانی چەکی نییە. بەڵام، برادەران نەیانوێرا، بێنەپێشەوە و ئەو کۆبوونەوەیە بکەین. چونکە، « پارتی کۆمۆنیست »، لە نیشەکەیدا سەرکەوتوو نەبوو، لە بەردەم « عەبدولکەریم »دا هیچیان بۆ نەکرا، « عەبدولکەریم » سەرکەوتبوو. لەبەرئەوە، بۆچوونەکەی « بارزانیی » زاڵبوو، کۆبوونەوەکەش نەکرا. لەو کاتانەشدا، « عەبدولکەریم قاسم »، لە سەر ڕووداوەکانی « کەرکووک »، وەتاری دابوو، « پارتی کۆمۆنیست »یش، قسەیانکردبوو. ئێمە، بڕیارماندا، بە بۆنەی گەڕانەوەی « مەلا مستەفا »وە، یەکەم کۆبوونەوە بکەین. کۆبوونەوەیەکمان، لە ماڵی خۆمان سازکرد. لەو ڕۆژەشدا، « عەبدولکەریم » بریندارکرا. لە کۆبوونەوەکەدا، کۆمەڵێکی نوێ، بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی « پارتیی » هەڵبژێررا. « مەلا مستەفا » وەتی: لە زۆر شت ڕازییم، کە ئاڵوگۆڕی بە سەردا هاتووە. بەڵام، لە هەڵبژاردنی هێندێ کەس ناڕازییم.
بێ گومان، « مەلا مستەفا »، مەبەسی لەو قسانە ئەوە بوو، کە هێشتا، ناکۆکییەکە نەبڕاوەتەوە و دەبێ، منیش نەبم. بۆ نموونە: « مەلا مستەفا »، لەو کاتەدا، ناکۆکییەکانی لەگەڵ مندا، زۆر خەست نەدەکردەوە، زۆری بەو شێوەیە نیشاندەدا، کە زۆر گوێ بە من نادا. ئەگینا وەنەبێ، پێکەوە دانیشتبین و لەو بارانەوە، وتوێژمانکردبێ. قسەکانی من، دژی ئەو بووبێ. یا، قسەکانی ئەو، دژی من بووبێ. وا دیاربوو، زۆربەی ئەو ناکۆکییانە، لەوەوە بوو، بەری هاندانی خەڵکی دیکە بێ، وەک لەوەی بەری ڕقی خۆی بێ.
ـ واتە: ناکۆکییەکانی نێوان، بەڕێزتان و « بارزانیی »، لە قاڵبێکی ئایدۆلۆژییدا نەبوون.
ئەو ماوەیە، شتێ لە نێوانماندا نەبوو. بەڵام، لە پێش هەرای « 1961 »وە، بە ماوەیە، پێش ئەوەی دەسپێبکا، ناکۆکیی لە نێوانماندا دروسبوو. دوای کۆبوونەوەکە، بڕیارماندا، کۆنفرانسێ بگرین. لەو کۆنفرانسەدا، « مەلا مستەفا »، بە هۆی دوکتۆر « مووراد » و « شێخ عەزیز » و ئەوانەوە، پرۆگرامێکی نوێیان، بۆ « پارتیی » دانا، نەختێکی، لەوەی پێشوو دەچوو. بەڵام، زۆریان لێ گۆڕیبوو، پێشکەش بە کۆنفرانسیان کرد. لەو دانیشتنەدا، لە سەر داواکاریی « مەلا مستەفا »، « هەمزە » و برادەرەکانی هەموو، لە

« پارتیی » دەر کران. پاشان، دەنگوباسی مۆڵەتوەرگرتن هاتەکایەوە. « مەلا مستەفا »ش، بۆ لای ئێمە گەڕایەوە. ئەم جارەیان، بە حسابەکەی منی کرد، من بوومەوە بە نازدارەکەی ئەو.
ــ واتە: سکرتێری « پارتیی ».
بەڵام، دیسانەوە، وەنەبێ، بڕوایەکی تەواویشی، بە من هەبووبێ. چونکە، لە بیر و بۆچووندا، من و ئەو، جیاوازبووین. کە لە سەفەرەکەم هاتمەوە، هەموو شتێکم بۆ دەرکەوت. لە برادەرانیشم گەیاند و ووتم: « مەلا مستەفا»، ئەو کەسە نییە، ئێمە بە تەمای بین. بەڵام، ئەو ناکۆکییەی، نێوان « هەمزە و بارزانیی »، ج پێوەندییەکی، بە منەوە نەبوو. بەڵکوو، شتی تایبەتیی، نێوان خۆیان بوو. بە پێچەوانەوە، جیاوازییەکەی نێوان من و « هەمزە عەبدوڵڵا »، کارێکی کردبوو، کاک « هەمزە »ی لای « بارزانیی » خۆشەویستر کردبوو، کە « مەلا مستەفا »ش هاتەوە، زیاتری لە یەکدی نزیکخستنەوە.

پ3: ئەوەی بیستوومە و لە نێو خەڵکدا باوە، گوایە: ئەو ناکۆکییەی، لە نێوان بەڕێزتان و « هەمزە عەبدوڵڵا »دا هەبوو، دوای ئەوەی، ساڵی « 1952 » بەربوون و هەر دوو باڵەکەی « پارتیی »ش یەکیگرتەوە، هەموو ناکۆکییەکانی نێوان خۆتانتان، لە ڕێی ژن و ژنخوازەوە پاکتاوکرد و ئاشتبوونەوە. ئایا، ئەوە ڕاستە؟
و3: نەء، هیچ پێوەندییەکی، بە باسی ژن و ژنخوازەوە نەبوو. بە پێچەوانەوە، لە ڕێی پارتایەتییەوە، ژن و ژنخوازییمان لە بەیندا بوو.
ـ واتە: پێش ئەوەی، ناکۆکیی لە نێوانتاندا دروسبێ، ئێوە، لە ڕێی ژنهێنانەوە تێکەڵاوبوون؟
بەڵێ. کاتێ « هەمزە »، لە ماڵی ئێمە دەژیا، هەموو شت بڕابۆوە. ئینجا، پارتایەتی دەسیپێکرد. من، لە سەرەتادا، ڕازیی نەبووم، کار لەگەڵ ئەواندا بکەم. چونکە، سکرتێری « ژ. ک. » بووم، نەشمدەویست، واز لە « ژ. ک. » بێنم. چونکە، بڕوایەکی تەواوم، بە کوردستانێتێکەی « ژ. ک. » هەبوو، وەک لەوەی، بڕوام بە پرۆگرامە سنوور بۆ دیاریکراوەکەی « پارتی دیموکراتی کورد » هەبووبێ. تەنانەت، پرۆگرامەکەشیان، من بۆم کردن بە کوردیی. لەگەڵ ئەوەشدا، کاک « هەمزە »، عەرەبییەکی زۆر باشی دەزانی، نووسینی جوانی لە عەرەبییدا هەیە. بەڵام، کوردیی باش نازانێ، بنووسێ.

پ4 : دوای ئەوەی، بەڕێزتان بوون بە سکرتێر و « بارزانیی ش، سەرۆکی « پارتیی » بوو، لەو ماوەیەوە، تا، سەرەتای دەسپێکردنی شۆڕشی «11/ سێپتێمبەر/1961 »، پێوەندیی نێوانتان چۆن بوو؟

و4 : ئەوەی من گەیشتبوومێ، ئەوە بوو: « مەلا مستەفا »، لە بیروباوەڕی من ڕازیی نەبوو، گەر چی، پەساپۆرت و پێویستییەکانی هاتنەوەی، بە هۆی منەوە، بۆی جێبەجێکرا. من چووم بۆ « پراگ » و هێنامەوە. بەدەم ڕێوە، گەلێ ئیشی پێ سپاردم، گەلێ هیوای گەورەی، خستە دڵمەوە، کە دەتوانین، شتی سەیر بکەین. پاشان، کە هاتەوە، نازانم، چی ڕوویدا، دوور نییە، کۆمۆنیستەکان، بیروڕایان گۆڕیبێ! بە تەواویی، بیروڕای بەرانبەر بە من گۆڕا. دوور نییە، « عەبدولکەریم قاسم » خۆی، بیروڕای گۆڕیبێ. « مەلا مستەفا »ی وا تێگەیاندبێ، کە من بە تەمای، جێگەکەی ئەوم و دەمەوێ، ببم بە سەرۆکی « پارتیی ». یا، لەوانەیە « بەعسیی یەکان» کاریانتێکردبێ. بۆیە، دەڵێم: کە گەڕاینەوە، « مەلا مستەفا »، بیروڕای بەرانبەر بە من گۆڕابوو، کەمێ لەگەڵمدا ساردبوو. من، هەستم بە هیچ شتێکیش نەدەکرد، هیچ شتێکیش، لە نێوانماندا نەبوو. ئێدی، من زۆر گوێم نەدایە ئەوە. چونکە، بە درێژایی تەمەنم، ئەو ماوەیەی سکرتێری « پارتیی » بووم، هەرگیز، ڕۆژێ لە ڕۆژان، خۆم بۆ شوێنی سکرتێری « پارتیی » نەپاڵاوتووە. تا، ڕۆژێ « نووریی ئەحمەدی تەها »، ڕەخنەیەکی زیرەکانەی لێ گرتم، ئێستەش، هەر لە دڵم دایە. لە کۆبوونەوەیەکدا، هەستا و ووتی: ئەری باوکم! ئێوە چی دەکەن، پیاوێ خۆی، بڕوا بە خۆی نەکا، خۆی هەڵبژێرێ و داوابکا و بڵێ: من هەڵبژێرن، ئێوە چۆن هەڵیدەبژێرن؟ جا، گەر ئێوە، باوەڕتان پێی هەیە، ئەوە شتێکی دیکەیە! ووتم: وەڵڵا، قسەکەت ڕاستە، باوەڕ بە خۆم ناکەم، کە بتوانم بەو ڕۆڵە گرنگە هەستم. « مەلا مستەفا » زیاتر، خەریکی برادەرانی دیکە بوو، زیاتر لەگەڵ ئەواندا، کاریدەکرد، زۆر گوێی بە من نەدەدا. ئەو، بە بڕوای خۆی سەرۆکە، کە سەرۆکیش هەبێ، ئێدی، سکرتێر ڕۆڵیکی، ئەوەندە گرنگی نامێنێ. لەبەرئەوە، من زۆر گوێم نەدایە ئەو ڕووداوانە، خۆم لێ لادا.
« مەلا مستەفا »، ڕۆژی «8،7 /1958/10 »، گەڕایەوە. دوای یەک دوو ڕۆژ، داوامانکرد، « عەبدولکەریم قاسم »، ببینین. « عەبدولکەریم »، تێلێفۆنی کرد بوو، منیش لەگەڵیان بچم. گەر چی، من ووتم: بوونی من، پێویست نییە.

چونکە، « مەلا مستەفا و ئەسعەد خۆشەویی و میر حاج ئەحمەد »، لە دەرەوەی وولات هاتوونەتەوە.
پاشان، بڕیارماندا، هەمووومان بچین. لای « عەبدولکەریم » دانیشتین. باس کرایەوە و قسەی، لەگەڵ « مەلا مستەفا »دا دەکرد. « مەلا مستەفا »، لە قسەکانیدا، کەمێ توندبوو. بە تایبەتیی، بەرانبەر دوژمنەکانی. چونکە، « عەبدولکەریم قاسم » داوای لێ کرد، ناکۆکیی نێوان خۆی و « زێباریی » و تیرە و هۆزەکانی دیکەی دەوروبەریان، ببڕێنێتەوە. ووتی: « عفا الله عما سلف ». دەبێ، لاپەڕەیەکی تازە بکەینەوە، ئەو کاتەی ئێوە لە « بارزان »، لەگەڵ تیرەکانی دیکە ڕێکدەکەونەوە، دێم بۆ لاتان و دەتانبینم و کۆمەکتان پێ دەکەم. « مەلا مستەفا »ش ووتی: ئەوانە، وایان لێ کردووین و وایان پێ کردووین، ئێمە ڕێک ناکەوین. « عەبدولکەریم »، ووتی: باشە، قەیناکە، گەر ڕێکیش ناکەون، بەڵام، با حوکوومەت و یاسا، ئەو ناکۆکییەی نێوان ئێوە چارەسەرکا، نەک ئێوە خۆتان، چارەیبکەن. دوای کەمێ، لەم باس و خوازانە، بیسانەوە، باسی ڕابوردوو کرا. پاشان ووتمان: هەستین بڕۆین، با لەوە زیاتر، کاتت لێ نەگرین. « عەبدولکەریم » ووتی: باشە، ئێوە بڕۆن، لای سکرتێرەکەم دانیشن، با، « مەلا » لێرە بمێنێتەوە، دوو قسەی لەگەڵ دەکەم.
من وامدەزانی، « عەبدولکەریم »، لە سەر ئەو قسانەی « مەلا مستەفا »، کردی، دەیەوێ، قسەی لەگەڵ بکا، تا، خاویکاتەوە و هیچ نەکا، بە هەر شێوەیە بێ، ڕازییکا، تا، لەگەڵ دوژمنەکانیدا ڕێکیانخاتەوە. بەڵام، ئەوەی لە دواییدا بۆم دەرکەوت، ئەوە بوو، « عەبدولکەریم »، باوەڕی پێ هێنابوو، کە من لەگەڵ کۆمەڵەکەی « عەبدولسەلام عارف »دا ڕێکم، لەگەڵ ئەو کۆمەڵەدا ڕێک نیم، کە « عەبدولکەریم » دەیەوێ. گەر چی، « عەبدولکەریم »، منی خۆش دەویست، ئەو ماوە کەمە، وای پیشاندەدا. بەڵام، لە گەڕانەوەی « بارزانیی » بۆ « عێراق »، « عەبدولکەریم »، یا پێی نەوترابوو، یا، حەزی نەدەکرد، « مەلا مستەفا » بگەڕێتەوە. چونکە، من لە ڕێی « عەبدولسەلام عارف » و « تایەر یەحیا »وە، کە ئەو کاتە، بەڕێوەبەری پۆلیسی گشتیی بوو. ماوەیە لەوە پێش، « کەریم قەرەنیی »، پێی ناساندبووم، لەم ڕێیانەوە توانیم، پەساپۆرت پەیدا کەم و لەگەڵ خۆم بیانبەم و بیانهێنمەوە. واتە: مۆڵەتی هاتنەوەی « بارزانیی »م، لە « عەبدولسەلام » وەرگرت. ڕەنگە، ئەمە وای پیشاندابێ، کە من، جۆرە پێوەندییەکم، لەگەڵ ئەواندا هەبێ.

« پارتی کۆمۆنیست »، بڵاویانکردبۆوه و به « عەبدولکەریم »شیان ڕاگەیاند بوو، کەوا، من وەک سکرتێری « پارتیی »، پێوەندییم لەگەڵ نەتەوەییەکانی عەرەبدا هەیە و لەگەڵیان ڕێککەوتووم، کوودەتایەک، دژی « عەبدولکەریم » بکەین. ئەم هەواڵە، گوایە: « پارتی کۆمۆنیست »، لە ڕۆژنامەکەشیاندا نووسیبوویان. ئەمە، هەموو ئەو چیرۆکە بوو، کە « عەبدولکەریم قاسم »، بۆ « مەلا مستەفا » گێڕابۆوه. ئیدی، لەو ڕۆژەوه، تا دەهات، « مەلا » لەگەڵ من، ساردییەکەی زیاتر دەبوو.

ماوەیەکی پێ چوو، بۆ مۆڵەتوەرگرتن، سەردانێکی « عەبدولکەریم قاسم »مان کرد. « قاسم »، هێندێ، ڕەخنەی لە پرۆگرامی « پارتیی » هەبوو. داوایدەکرد، هێندێ خاڵی بگۆڕین. « مەلا مستەفا »ش، زۆر پشگیریی، لە قسەکانی « عەبدولکەریم » دەکرد. دەیویست، لەو گۆڕینانەدا، دڵی « عەبدولکەریم » ڕاگرێ. بێ گومان، من وەک سکرتێری « پارتیی »، دەسم لە نووسین و داڕشتنی، پرۆگرامەکەدا هەبوو. دەبووایە، داکۆکیی لە پێشنیازەکانی خۆمان بکەم. بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا، هێندکیمان پەسەندکرد. چونکە، بێ ئەوە، مۆڵەتیان نەدەداینێ. واتە: پارتەکەمان، لە ڕووی یاساییەوه، نەدەناسرا.

ئەوەبوو، مۆڵەتمان وەرگرت. دوای ئەوەی، مۆڵەتمان وەرگرت، « مەلا مستەفا » دەیویست، هێندێ مرۆڤی دیاریکراو، بێنێتە پێشەوە و لە کۆمیتەی ناوەندیی و پەلیتبیرۆی « پارتیی »دا دایاننێ. ئێمە، چ گلەییەکمان نەبوو. ویستمان، بۆ یەکەم جار، کۆنگرەیەکی ئاشکرا بگرین. کۆنگرەمان گرت. بەڵام، « مەلا مستەفا » لە « بارزان » بوو، بۆ کۆنگرەکە نەهات. ناچار، دوو ڕۆژ، کۆنگرەکەمان دواخست، تا، « مەلا مستەفا » بێ. ئەوەبوو، دوایی، کۆمەڵێ خەڵکمان نارد بە دوایدا. ووتبووی: نایەم و ئەم کۆبوونەوەیە ناکەم، ئەم کۆنگرەیە خراپە و هەڵەیە. هەر چۆنێ بوو، هێنامان. ووتمان: چ فرمانێکت هەیە، فەرموو، بۆت جێبەجێکەین.

ــ کۆنگرەکە لە کوێ گیرا؟

کۆنگرەکە، لە بارەگای « پارتیی » لە « بەغدا » گیرا. جێیەکمان بۆ گرتبوو، ناویاننابوو، بارەگای « پارتی دیموکراتی کوردستان ــ عێراق »یکیشی لەگەڵ بوو. « مەلا مستەفا » گەیشتە « بەغدا ». چووم بۆ ماڵەوە بە دوایدا و هێنام. دیاربوو، هێندێ کەس لە بنەوە، کنەیانکردبوو. ئێشەکە، لە نێوان ئێمە و « مەلا مستەفا »دا تێکبدەن. لەو کاتەدا، « عەبدولکەریم قاسم »، بەرنامەی

ئەوەی دانابوو، کە هەموو پارتە رامیارییەکانی « عێراق » تێکدا. بۆ نموونە: توانیی، « پارتی کۆمۆنیستی عێراق » دووکەرتکا، پارتێکی درۆی دروسکرد، « داود سایغ »، کە کۆنە کۆمۆنیستێکی هیچوپووچ بوو، کردی بە سکرتێری ئەو پارتە داتاشراوە، پارتە کۆمۆنیستە رەسەنەکەشی، پشگوێخست. لە پاشان، « حیزبی ئەلدیومسقراتی ئەلوەتەنی » کە « کامل چادرچیی » لێپرسراویان بوو، ئەویشی کرد بە دوو پارچەوە. کۆمەڵێ لەگەڵ « محەمەد حەدید » رۆیشتن. کۆمەڵەکەی دیکەشیان، لەگەڵ « کامل چادرچیی » مانەوە. هەروەها، هەوڵیدەدا، دووبەرەکیی لە نێو هەمـــــوو، رێکخراو و پارتە رامیارییەکانی « عێراق »دا دروسکا. مابۆوە سەر ئێمە، تا ئەو کاتە، ئێمەی پێ دوولەت نەکرابوو. لەو کاتەدا، بە هەلی زانی، کە ئێشەکەمان لێ تێکدا. دیاربوو، « مەلا مستەفا »ش هاندرابوو. چونکە، کە هاتە کۆنگرەکەوە، گەلێ قسەی خراپی کرد، قسەی زۆر ناشیرین، کە نابێ بووترێ.

ـ مەبەستتان کۆنگرەی پێنجە؟

بەڵێ. لە کۆنگرەی پێنجدا، بە ئاشکرا، گلەیی لەوە هەبوو، کە لقی « هەولێر » سوکایەتییان، بە ئاغاکان کردووە و دەریانکردوون. هەروەها، لە « قەلادزێ » سوکایەتییان پێ کردوون. ئەوان، ئاغاکان بە چاوێکی سووک سەیردەکەن. خۆیان بە پێشکەوتووخواز دادەنێن. هێندێ وردە گلەیی دیکەش. بۆیە، قەبووڵی نییە، سەرۆکی ئەو پارتە بێ، گەر ئەم پارتە، بەم شێوەیە بمێنێتەوە. لە کۆنگرەکەدا، بوو بە هەراهەرا و قرەقر. لە پاشان، داواکرا، کە کۆبوونەوەکە دواخرێ، تا، « نووریی شاوەیس »، یەکێ لەو کەسانە بوو، خەریکبوو، بە گژیدابچێتەوە. بە گژیشیداچوو، تا ئەندازەیە، بە توندوتیژیی، وەلامی قسەکانیشی دایەوە. ئەو رۆژە، وا بزانم، نۆ یا دەی مانگی « مای » بوو. لەو رۆژەدا، لە باڵوێزخانەی « چیکۆسلۆفاکیا »، بە بۆنەی یادی سەربەخۆیی وڵاتەکەیانەوە، ئاهەنگێ هەبوو. ئێمەش، بانگکرابووین. ووتمان: با، ئەوە بکەین بە بەهانە، هیچ نەبێ، کۆنگرەکەمان دواخەین. چونکە، کۆبوونەوەکانمان، بەو قسە ناخۆشانە نابرێتەوە و بە هیچ، سەرەنجامێکی باشیش ناکەین. گەر چی، لە دوای قسەکانی « مەلا مستەفا »، زۆر لە برادەران، پەشیمانبووبوونەوە. بەشێکی زۆریان، بریاریاندابوو، کە سبەینێ بگەرێنەوە و وازبێنن. من، لەگەڵ یەک دوو برادەر، بۆ ئاهەنگەکەی باڵوێزخانەی « چیکۆسلۆفاکیا » چووین. لەوێ، لە چیمەنێکی گەورەدا

دانیشتبووین. خەڵکیکی زۆر بانگکرابوو. باڵوێز و وەزیر و هەموو پیاوی گەورەی شار و نازانم، کێ وکێی دیکە، داوەتکرابوون و دەیانخواردەوە. ئەوەندەی پێ نەچوو، بژی بژی « زەعیم »، « عاشە زەعیم ئەلئەوحەد »، دەسپێکرد، لە « وەزارەتی دیفاع »ەوە، دەنگ دەگەیشتە ئەوێ، کە ئێمە لە لای، باخچەی « سەعدوون » خوارتر بووین. چەپلەڕێزان و هاوارهاواربوو، تا، سەرۆک گەیشتە جێ. « عەبدولکەریم » هات بۆ ئاهەنگەکە و لە هەموو لایەکەوە، تەوقەی لەگەڵ هەموو کەس دەکرد. لە چەپەرێکدا وەستابووم، منی دی. « ها ئیبراهیم »، هاتە پێشەوە و دەسی خستە سەرشانم و بردمییە ئەو لاوە. لە بەر چاوی ئەو هەموو خەڵکە، شتێکی سەیربوو. ووتی: گوێم لە هەموو قسەکانی، کۆنگرەکەتان بوو، چی لە کۆنگرەکەتاندا دەکرێ، هەموویان بۆ گێراومەتەوە. لە سەداسەد، من لەگەڵ بیروڕای تۆم. من لەگەڵ، بیروڕای ئەوانی دیکە نیم. بێ گومان، ئەوانی دیکە، کەس نەبوو، بیروڕایەکی جیاواز و دژی هەبووبێ، بە دەنگ قەبووڵ بکرێ، ئەوەی ڕای تایبەتیی بووبێ و لەگەڵ نەبووبێ، هەر ڕای « مەلا مستەفا » بوو. پاشان ووتی: لەبەرئەوە، تۆ لە سەر ڕای خۆت برۆ و پەشیمان مەبەرەوە.

خێرا، بە پەلە، چووم بۆ لای « نووریی شاوەیش ». هەر لەوێ، پێکەوە هات بووین. ئەویش، وەک ئەندامی پەلیتبیرۆی « پارتیی » بانگکرابوو. برادەرێکی دیکەشمان لەگەڵ بوو، هاتینە دەرەوە. ووتیان: چییە؟ ووتم: ئیشێکی پەلە هەیە، دەبێ، بڕۆین. خۆمان بگەیەنینە ئەو برادەرانەی دەیانەوێ، بگەڕێنەوە. دەبێ، کۆبوونەوەیەک سازکرێ، بڕیارێکی گرنگ هەیە، دەبێ، بیدەین. ووتیان: چییە؟ ووتم: « عەبدولکەریم قاسم »، ئەمەی پێ وتووم. ئەمە، واتای ئەوەیە، دەیەوێ، ئێمە بەکاربێنێ، بۆ ئەوەی، دژی « مەلا مستەفا » ڕاوەستین. دەیەوێ، ڕێکخراوەکەمان دووپارچەکا. کەواتە: ئێمە دەبێ، هەوڵبدەین، بە پەلە، شتێ بکەین. لە سەر ئەوە ڕێککەوتین، بۆ بەیانیی، کۆبوونەوەیەک بکەین و بە هەمووان بڵێین: ئەو خاڵانەی نێو پرۆگرامەکە، کە « مەلا مستەفا » لە سەری ڕازیی نییە، لایدەبەین. ئەوەی کە « عەبدولکەریم » ڕازیی لە سەر نییە، نایەنووسین. بەلام، پێڕەویدەکەین. بۆ بەیانیی، کۆبوونەوەکەمان کرد، نزیکەی سێ چارەکی ئەندامانی کۆنگرە ئامادەبوون. دوای ئەوەی، باسەکەمانکردەوە، هێندێ لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی، مەردانە هەستان و ووتیان: ئەمە شتێکی یاسایی نییە. ئەم کارە، پێچەوانەی پێڕەوی نێوخۆیە، دەمانەوێ،

بزانین، بۆچی هەموو، قسە و باس و نهێنییەکانی کۆنگرە و « پارتیی »، بە « عەبدولکەریم » دەگا. بوو بە هەرا و نارەزاییدەربڕین. بەڵام، هیچ کەڵکی نەبوو. نارەزاییەکە سەری نەگرت. چونکە، ئەوەی بڕیارماندابوو، چاکتر و کەم مەترسیتربوو، هەموویانمان لە ڕاستیی پیلانەکە تێگەیاند. تەنیا، ئەوەمان پێ نەووتن، کە « عەبدولکەریم » بە ئاشکرا، چی بە من ووتووە. بڕیاردرا، وا بکەین، بۆ ئەوەی، کارەکەمان لێ تێک نەچێ. دوایی، کۆمیتەی ناوەندیی هەڵبژێررا. ئەو کەسانەی « مەلا مستەفا » دایانابوون، هەموویان هەڵبژێرران.
پاشان، لە خوارووی « بەغدا »، لە ماڵی دوکتۆر « مووراد » کۆبووینەوە، تا، ئەندامانی پەلیتبیرۆ و سکرتێری کۆمیتەی ناوەندیی هەڵبژێرین. لە پێشدا، پەلیتبیرۆ هەڵبژێررا. دوایی، هاتە سەر ئەوەی، سکرتێر هەڵبژێررێ. من وەک جاران، خۆم نەپاڵاوت. سێ چوار کەس، منیان دەسنیشانکرد، کە بە سکرتێر دانرێم. دیسانەوە، « نووریی ئەحمەدی تەها »، قسەی خۆی کردەوە، کەوا، بۆچی دەبێ، من هەڵبژێررێم، گەر خۆم نەمەوێ. بە کەورتیی: دەنگدان کرا. وا بزانم، ئێمە پازدە کەس بووین. من، نۆ دەنگم وەرگرت. « شێخ عەزیزی شەمزینیی »، شەش دەنگی هێنا. کە دەنگەکان خوێنرانەوە، « مەلا مستەفا » وەک شتێ، خەوی لێ کەوتبوو. ووتمان: ها، فەرموو، « مەلا مستەفا » چییە؟ ووتی: من تاقەتم چوو، دەڕۆم. من بیستبووم،« مەلا مستەفا » دەیویست، « شێخ عەزیز » ببێ بە سکرتێر. بەڵام، لەو بارەیەوە، هیچی بە من نەوتبوو. لە ڕێیەکەوە بیستبووم و تێگەیشتم، کە ئەوەش هەنگاوێکە لەوانەی، بۆ پارچەپارچەکردنی « پارتیی » دەنرێ. ئەگینا، من دەمزانی، « شێخ عەزیزی شەمزینیی »، ئەوەندە مرۆڤێکی باشە، گەر سکرتێری « پارتیی » بێ، من زیاتر دەسەڵاتم دەبێ، لەوەی کە خۆم سکرتێر بم. بڕوایەکی زۆریشی، بە من هەبوو. من ئەمانەم، هەموو دەزانی. بەڵام، « مەلا مستەفا »، هیچی بە من نەوتبوو. ئەو برادەرەی، لە دەرەوە پێی ووتم، تەنانەت، من گومانم لەو قسەیەی ئەویش هەبوو، لەبەرئەوە، کە دیم « مەلا مستەفا » حاڵی وایە، ووتم: براینە، من خۆم بۆ سکرتێر نەپاڵاوتووە، ئێوە هەڵتانبژاردووم، من ئەمەم قەبووڵ نییە. دیسانەوە، « نووریی شاوەیس »، لەوێش هەستا، ووتی: ئەمەی تۆ ڕا نییە و بەپێی پێڕەوی نێوخۆ ڕاست نییە. ئەمە مەرایییە دەیکەی. زۆربەی ئەندامان دەنگیان بۆ تۆ داوە، چۆن تۆ بە زۆربەی دەنگ

هەلبژێرراوی، ئێستە، دەنگی زۆربە ڕەتدەکەیتەوە؟ ووتم: من بەوە ڕازیی نیم و
گەر حەزیش دەکەن، هەر واز لە ئەندامەتی کۆمیتەی ناوەندییش دێنم. بەلام،
هەر ئەندامی « پارتیی » دەبم، یا دەبێ، دیسانەوە، هەلبژاردن بکرێتەوە،
ڕاکەی منیان خستە دەنگەوە، زۆربە دەنگیاندا، جارێکی دیکەش، هەلبژاردن
بکرێتەوە. ئەم جارە، « شێخ عەزیز »، پێنج دەنگی وەرگرت. چونکە، من خۆم،
دەنگم بۆ خۆم نەدابوو. پارچە کاغەزەکەی خۆم، هەر وا، بە سپێتی دایەوە
دەسیان و کەسم نەنووسیبوو. چونکە، کەسی دیکە خۆی نەپالاوتبوو، هەر من
و « شێخ عەزیز » بووین. تومەز، « شێخ عەزیز » ئەم جارە، دەنگی بۆ خۆی
نەداوە. « مەلا مستەفا »، ئەم هەلبژاردنەیّ منی بە دڵ نەبوو!
ناکۆکیی، لە سەر چی دەسیپێکرد؟ لە سەر ئەوەی، « مەلا مستەفا »، وا دیار
بوو، چ لە لایەن سەرۆک تیرە و هۆزەکانەوە، چ لە لایەن ئەندامەکانی
دەوروبەرییەوە، یا بلێین، لە لایەن بەکرێگیراو و سیخوڕی دەولەتەکانەوە بوو
بێ، کە دژی « عەبدولکەریم قاسم » و ڕژێمەکەی بوون، تیژکرابێ. چونکە،
« مەلا مستەفا »، هەلوێستی خۆی، بەرانبەر « عەبدولکەریم » گۆڕیبوو. من
یەکەم جار، ئەمەم لە دەمی « مام جەلال »ەوە بیست. لە سەر ئەم هەوالە
گرنگە، چاوم بە « مەلا مستەفا » کەوت. « مەلا مستەفا »، لە قسەکانیدا
ووتی: « عەبدولکەریم »، پیاوێکی باش نییە. من دەگەڕێمەوە بۆ « بارزان »،
لەوێ دادەنیشم، هیچ ناکەم، بەلام، دژی ئەو جولانەوەیەش نابم، کە تیرە و
هۆزەکانی کوردستان، بە دەسیانەوەیە بیکەن. لەو کاتەدا، خێلەکان بە
هاندانی « ئێران، ئەمێریکا، ئوردوون و تورکیا »، خەریکی شتێ بوون، لە
کوردستاندا دژی « قاسم » بیکەن. « مەلا مستەفا » ووتی: ئەمە، بۆ ئێمە،
شتێکی زۆر باشە. « عەبدولکەریم قاسم »، بەوانەوە سەرقالدەبێ، ناتوانێ،
چەک و جبەخانەیەکی زۆر، بە لەشکرەکەی بدا. چونکە، باوەڕی پێیان نییە.
لەبەرئەوە، کە شەڕ دەسیپێکرد، یەکسەر، تۆ بانگدەکا و پێت دەلێ: فلانە
کەس وەرە، چارەسەرێکی ئەم گرفتەم بۆ بکە. تۆش دەلێی: من هیچم بە دەس
نییە و ئاگام لە هیچ نییە. گەر یەکێ بتوانێ، کارێ بکا و یارمەتیتبدا، ئەوە
تەنیا « مەلا مستەفا »یە. ئەویش، بانگی « ئەحمەد سالح عەبدیی » دەکا، کە
ئەو کاتە، سەرۆک ئەرکانی سوپای « عێراق » بوو، لەگەل تۆ، سواری
هەلیکۆپتەرتان دەکا و بۆ لای منتان ڕەوانەدەکا. منیش، لەگەل « ئەحمەد
سالح عەبدیی » دادەنیشم، وتوویژی لەگەل دەکەم. تۆش بۆ خۆت، لە ژوورێکی

دیکە دانیشە، داخوازییەکانی گەلی کورد بنووسە. ئەو کاتە، « عەبدولکەریم» ناچاردەبێ، مل بۆ داواکارییەکانمان بدا. ووتم: « مەلا مستەفا »، قسەکانی تۆ، چەند جوان و باش و ڕێکوپێکبێ، بەلام، لای من، هەمووی ناچنە دلەوە. ڕاستە، « عەبدولکەریم قاسم »، بڕوای بە لەشکرەکەی نییە، تفەنگ و فیشەک و جبەخانە و تۆپ و فڕۆکەشیان ناداتە دەس، بۆ؟ چونکە، لەوە دەترسێ، دژی خۆی بەکاریبێنن. عەرەب، بە « عەبدولکەریم قاسم » دەلێن: « قاسم ئەلعراق » واتە: « عێراق »ی دابەشکردووە، بەشێکی کورد و بەشەکەی دیکەی عەرەب. نەتەوەییەکانی عەرەب، لە خۆپیشاندانەکانیاندا دەلێن: « وطن واحد، شعب واحد ». بەلام، ئەو کاتەی نەتەوەییەکان زانییان، « عەبدولکەریم »، ئەم چەکانەیان بۆیە دەداتێ، کە کوردی پێ بکوژن، بە هەموو دلەوە ئامادەن، چەکی بۆ هەلگرن و شەڕی بۆ بکەن و کوردی بۆ بکوژن، چونکە، بە حسابی خۆیان، بەمە، لە دەس کورد ڕزگاریاندەبێ، کە بە دوژمنی گەورەی خۆیانی دادەنین. لە هەمان کاتدا، « عەبدولکەریم »یشی پێ لاواز دەکەن، تا، لە دواییدا، هەر بەو چەکەی پێی داون، ئەویش لەنێوبەرن. یا، لە دەسەلات و فەرمانڕەوایی دووریخەنەوە. ووتی: ئاخر « برایم »، بۆیە، من دەلێم: من و تۆ ناتوانین، پێکەوە کاربکەین. ووتم: وەللایی، من قەسەی خۆم دەکەم، ئەمە، بیروڕای منە، جا، تۆش هەموو شت، بە دەس خۆتە. ووتی: باشە، کەواتە، ئێوە شتێکی دیکە هەیە، بیکەن. ئێوە خۆتان، لە هیچ شتێ هەلمەقورتێنن. منیش دەچم، کاری خۆم جێبەجێدەکەم، لە « بارزان » دادەنیشم، هەقی هیچم نابێ و شەڕ ناکەم. بەلام، دژی ئەوانیش ناوەستمەوە. ئێوەش، لێرەوە بلێن: ئێمە لە هیچدا نین و ئاگامان لە هیچ نییە. بۆ خۆتان لێرە، کاری ڕامیاریی بکەن، چی دیکە دەکەن، بیکەن. ئەوەبوو، « مەلا مستەفا » گەڕایەوە بۆ « بارزان ».

پاشان، دەسکرا بەو هەراوهوریایەی، کە خێلە کوردەکان دایانمەزراند. ئێمە، لە « بەغدا »، لە مالی خۆمان، لە مانگی « ئۆگەستی/1961 »دا، کۆبوونەوەیەکمانکرد، هەموو ئەو ئەندامانەی کۆمیتەی ناوەندیی، کە تا ئەو کاتە، لە لایەن حوکوومەتەوە نەگیرابوون، ئامادەی ئەو کۆبوونەوەیە بوون.

لە ڕاستیدا، « عەبدولکەریم قاسم »، بەرانبەر بە « پارتیی »، هەلسوکەوتی خۆی گۆڕیبوو، بە تەواویی، دوژمنایەتییدەکردین، ئەندامەکانی دەگرتین. هێندێ لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندییمان گیرابوون. منیان دابوو بە دادگەی

سەربازیی. لە کۆبوونەوەکەدا، باسی ئەم کێشە گرنگەمان کرد، بیرمان لەوە کردەوە، ئایا، ئێمە چی بکەین؟ پشگیریی ئەم بزووتنەوەیە بکەین، یا دژی بوەستین؟ برادەران، بە زۆربەی دەنگ، لەو باوەڕەدا بوون، کە ئێمە، دژی ئەم جوڵانەوەیە بوەستین و شەڕ نەکەین. زۆریان، هاتنە سەر ئەو ڕایەی من، کە بۆ « مەلا مستەفا »م باسکردبوو. تەنیا، دوو برادەر نەبێ، لەگەڵ ئەو ڕایەدا نەبوون، دوودڵبوون. یەکێکیان « مام جەلال » بوو. ئــــەوی دیکەشیان، کاک « عومەر دەبابە » بوو. کاک « عومەر »، لە گرتووخانە ڕایکردبوو، نازانم، بۆ خەستەخانە و شت هێنابوویانە دەرێ، ئەویش، بە هەلی زانیبوو، لە دەسیان هەڵاتبوو، خۆی گەیاندبووە لای من. ڕای زۆربە، بەو چەشنەبوو، بۆیە، ئەوانی دیکەش، ناچاربوون، بەو شێوەیە بجوڵێنەوە و گوێ بۆ دەنگی داخوازییەکانی ئێمە ڕاگرن. پاشان، بڕیارماندا، نامەیە بۆ « مەلا مستەفا » بنووسین. لە نامەکەدا، هەڵویستی خۆمان، بەم جۆرە دیاریکرد. ئێمە، وەک « پارتیی » ئامادەین، هانی خەڵک بدەین، دژی « عەبدولکەریم » چەکهەڵگرن، خۆشمان، چەکهەڵگرین و شەڕبکەین. بەلام، لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا:
1. گەر « عەبدولکەریم قاسم »، ملی بە دیکتاتۆرییەوە نا و دیمۆکراسیی پێشیلکرد و دژی « پارتیی » وەستایەوە، ئامادەین، بە گژیدابچین.
2. گەر دەستووری تازەیان دانا و باسی « ئۆتۆنۆمیی »، بۆ کورد تێدا نەبوو.
3. گەر پەلاماری هۆزی « بارزان » بدا.
ئەم نامەیەمان، بە « مام جەلال و نووریی ئەحمەدی تەها »دا نارد. « مام جەلال »، نامەکە بگەیەنێ، کاک « نووریی »ش، بەو ناوانەدا بگەڕێ، تا بزانێ، ئەندامانی ئێمە، یاریدەدەرەکانمان، دۆستەکانمان، چەکێ، شتێکیان هەیە. ژمارەیەکی وان، کە سبەی قەوما، پشتیان پێ ببەسرێ. گەر، ناچاربووین، شەڕبکەین. ئەوان، نامەیان برد و چوون. ئێمەش، لە سەر بڕیاری خۆمان ڕۆشتین.
پاشان، من لەگەڵ « پارتی کۆمۆنیستی عێراق »یشدا، کۆبوونەوەیەکم کرد. دیسانەوە، هەمان قسەمان پێ ووتن، ئەوە باسێکی درێژە. ئێمە لێرەدا، مەبەسمان نییە، لێی بدوێین.
خێڵە کوردەکان، جموجۆڵێکی سەیریان پێ کەوتبوو. « عەلی حەسەن ئاغای مەنگوڕ»، لە گوندەکەی خۆی « هێرۆ »، ئالای سەربەخۆیی کوردستانی هەڵکردبوو. دەوڵەتی « ئێران »، پشتیوانییەکی باشی لێ دەکردن. بۆمان

دەرکەوت، بۆ ئەم هەرا و بەزمە، پێشەکیی، کارێکی زۆری بۆ کراوە. ئێمە، لەو باوەڕەدا بووین، کە گەر هەر شەڕێ و شۆڕش لە کوردستان دەسپێبکا، با، لە دەس خێڵەکاندا نەبێ. هەوڵبدەین، شۆڕشەکە، لە لادێوە بۆ شار بگوێزینەوە. چونکە، گەر لە شارەوە دەسپێکرد، ئەوا، ڕێیەک بۆ نزیکبوونەوە و ئاشتیی، هەر دەدۆزرێتەوە. بەڵام، گەر لە شاخەوە دەسپێکرد، سەرۆک خێڵەکان، بە شێوەیەکی سەرەکیی، دەسیان تێیدا هەبوو، هەر سەرۆک تیرە و هۆزێ، بە لای خۆیدا ڕایدەکێشێ. لەبەرئەوە، ووتمان: هەلێکی زۆر باشمان، لە بەردەم دایە، بە بۆنەی یادی، ڕۆژی ڕەشی « 6/سێپتێمبەری/1930 »وە، لە هەموو کوردستاندا، مانگرتن ڕادەگەیەنین. داوای مافە ڕەواکانی، گەلی کورد دەکەین. بە کردەوەش، ئەم بڕیارەمان جێبەجێکرد. بە ڕاستیی، دەڵێم: ئەوەتەی کوردستان هەیە، هەرگیز، مانگرتنێکی سەرکەوتووی وای، تێدا نەکراوە! هەر لە « زاخۆ و دهۆک »وە، تا « مەندەلیی و خانەقین »ی گرتبۆوە. لە هێندێ جێ، هەموو خەڵکەکە بەشدارییان تێدا کردبوو. لە هێندێ شوێنی دیکە، 80 ٪ و لە هێندێ جێی دیکەش، لە 50٪ بەشدارییانکردبوو. بەڵام، مانگرتنەکە، لە نێو خەڵکدا، دەنگێکی سەیری دایەوە!

داشمان نابوو، حەفدەی مانگی « سێپتێمبەر »، بچین بۆ « سولەیمانیی »، کۆنفرانسێ ببەستین. لەوێوە، هەموو بڕیارێبدەین. بەر لەوەی، ئیشەکە لەدەسدەرچێ. چی بکەین؟ چونکە، دوو سێ یاداشتمان، بۆ « عەبدولکەریم قاسم » نووسیبوو، تێیدا، هەموو داخوازییەکانی خۆمانمان ڕوونکردبۆوە. بەڵام، هیچ وەڵامێکی نەبوو. بە پێچەوانەوە هەوڵیدەدا، ئەو تیرە و هۆزانەی، پێی ڕادەکێشرا، زیاتر بە لای خۆیدا ڕایانکێشێ. ئەوانەشی، لە دەس ئەو دەرچووبوون، ئەوا، لەگەڵ لاکەی دیکەدا ڕۆشتبوون. لەو کاتەدا، من فرمانی گرتنم، لە لایەن حوکوومەتەوە دەرچووبوو، بە تاوانی ئەوەی، گوایە: « سدیق میران »، من کوشتوومە ! بێ گومـــان، ئەوە یەکێ بوو، لە کەرێتییەکانی « عەبدولکەریم »، بە حسابی خۆی، « پارتیی » پێ دەشکێنێ. بە قاچـاغ، لە « بەغدا »وە، بە هۆی برادەرانەوە، خۆم گەیاندەوە « سولەیمانیی ». لەوێ، بە تەمای ئەوەنبووین، کۆبوونەوەکەمان بکەین. لەو کاتانەدا بیستمان، حوکوومەتی « عێراق »، بە هۆی تیپی دووی سوپاکەیەوە، لە نێو خەڵکیدا بڵاویدەکردەوە، کەوا، « مەلا مستەفا و شێخ ئەحمەد و پشدەر »یان لەگەڵە. هەر لەو کاتەشدا بوو، حوکوومەت لە نۆ و دەی مانگی « ئۆکتۆبەر »دا، لە

ئاسمانەوە، شاری « سولەیمانیی »یان، دایە بەر شەستیر و چەند بۆمبایەکیشی، لە دەرەوەی « سولەیمانیی » تەقاند. ئاغاکانیش، لە شەڕەکەدا شکان و ڕایانکرد.
ـ مامۆستا، مەبەستت شەڕی « دەربەندی بازیانە »؟
بەڵێ. ئەو برادەرانەی ئێمە، کە بە قسەی « مەلا مستەفا »، تێکەڵی شەڕەکە بووبوون، لەگەڵ چەکداری خێڵکاندا، هاوبەشییانکردبوو. هێشتا، هیچ جۆرە بڕیارێکی ئاشکرای، پەلیتبیرۆی « پارتیی »ش نەبوو، تا، بەشداریی شەڕەکە بکەن، یا، بەشداریی نەکەن. پێیان دەووتن: « سەرچەور، مەتارە لە مل، مەنسول حیفز » * بێ، بزانە، چی دەڵێ؟ کە عەرەبەکان، ئەفسەرەکان دەهاتن و قسەیان لەگەڵ دەکردن، ئەمە گوایە، گفتوگۆدەکەن، ڕێکیش نەکەوتن. لە کۆتاییدا، کە فڕۆکە جەنگییەکانی « عێراق » هاتن و بۆردومانیکردن، هەموو ڕایانکرد و ووتیان: ئێمە، لەگەڵ ئاسماندا، شەڕمان پێ ناکرێ! ئەوان ڕایانکرد و ڕۆشتن. ئێمەش وامانزانی، شتەکە دەبڕێتەوە. لەو کاتەدا ویستمان، نوێنەر بۆ لای « مەلا مستەفا » بنێرین، پێی بڵێین: گەر ڕاستەدەکەی و پێوەندییت لەگەڵ حوکوومەت هەیە، ئەوا، ناو و ناوبانگ و دەسەلاتی خۆت، لای حوکوومەتی « عێراق » بەکاربێنە، بۆ ئەوەی، لە نێوان تیرە و هۆزەکان و حوکوومەتدا، ڕۆڵی ناوبژیکەر ببینی، کە تا ئێستە دەتووت: دۆستمن، هەولبدە، ڕێکیانخەیتەوە، کۆتایی بەم شەڕ و هەرایە بهێنرێ و وەک پێشوو، سەرلەنوێ دەسپێبکەینەوە. ئێمە، لەمەدا بووین، ئەم کارە جێبەجێکەین. بەڵام، لەبەر هێندێ هۆ نەمانتوانی، بیکەین.
جا، بیرمچوو، باسی ئەو نامەیە بکەم، کە بە « مام جەلال »دا، بۆ « مەلا مستەفا »مان نارد. « مام جەلال » چووبوو بۆ « بارزان » و نامەکەی بۆ « مەلا مستەفا » بردبوو. « مەلا مستەفا»، مەرجەکانی ئێمەی، هەموو پەسەندکردبوو، بە مەرجێ، هۆزی « هەباسی مەمەند ئاغا »شی بخەینەسەر. هۆزەکەی ناوی چییە؟
ـ ئاکۆ.
واتە: گەر حوکوومەت، پەلاماری هۆزی « ئاکۆ »شیدا، ئێمەش، شەڕ دامەزرێنین. « مام جەلال »، کە ئەم هەواڵەی پێیە، بە ناو « بڵباس »ەکاندا،

---

* « مەنسول حیفز »، مەبەس لە « مەسئولی حیزب »ە.

بە دڵخۆشییەوە دەگەڕێتەوە. دەبینێ، لە ماڵی « هەباس ئاغا »، کۆبوونەوەیەکی سەیر هەیە. تومەز، هێندێ لە تیرە و هۆزەکان، لەوێ کۆبوونەوەیان هەیە. « مام جەلال »یش، بە دڵێکی خۆشەوە، نامەکە دەردێنێ و وەلامەکەی، « مەلا مستەفا » بۆ ئێمە، پیشانی « هەباس ئاغا » دەدا.
« هەباس ئاغا »ش، دەستەکا بە گیرفانیدا و نامەیە دەردێنێ، دەڵێ: ئەمەم، لە پێش تۆدا بۆ هاتووە، سەیرێکیبکە. لە نامەکەدا نووسرابوو، ئێوە لە سەر حسابی خۆتان بڕۆن، گوێ بە ڕای « پارتیی » مەدەن.
ـ « بارزانیی »، نامەکەی ناردبوو؟
بەڵێ. « بارزانیی » ناردبووی. « هەباس ئاغا » پێی دەڵێ: ئەمە ئیشەکەیە، چا چی دەڵێی؟ ئەمە، « مام جەلال »ی وا لێ کردبوو، لەو کاتەوە، ئەو باوەڕەی، بە « مەلا مستەفا » نەمێنێ، کە پێشتر هەیبوو.
ـ بەلام، وەک ئاشکرایە، « جەلال تاڵەبانیی »، یەکێ بووە لەوانەی، زۆر بە گەرمیی، پشگیریی لە خەباتی چەکداریی لە کوردستاندا دەکرد.
بەڵێ. ناڵێم: ئەو لە سەر ئەوە سووربوو. بەلام، دیارە چاری نەبوو. دەیویست، بە بڕیاری « پارتیی » بیکا. چونکە، ئەو ئەندامی « پارتیی » بوو. واتە: نەیدەویست، بە شێوەی تیرەگەریی بیکا و بچێ، بۆ لای « مەلا مستەفا » و ملکەچی ئەو بێ و فەرمانەکانی جێبەجێکا. « مام جەلال » گەڕایەوە، هەموو شتەکانی بۆ باسکردین. ئێمە، ترسمان لێ نیشت. لەوە دەترساین، شەڕەکە، بە تەواویی دامەزرێ. پاش ماوەیە، هەواڵمانزانی، کە حوکوومەت، گوندەکانی ناوچەی « بارزان »ی، بۆردومانکردووە.
ـ بەلام، ئەو کاتە، « شێخ ئەحمەد » لەوێ دانیشتبوو.
بەڵێ. « شێخ ئەحمەد » لەوێ بوو. هەقی هیچی نەبوو. « مەلا مستەفا »ش، هەر لەوێ بوو. تەنانەت حوکوومەت، بە دایرەکانی خۆی ڕاگەیاندبوو، لە سەربانەکان، « خاچێکی سوور » دروسکەن، بۆ ئەوەی، فڕۆکەوانەکان ئەو جێیانە ببینن و بۆردومانی، ئەو شوێنانە نەکەن. ئێمە ئەم هەواڵەمان، لە لێپرسراوێکی ئەوێ بیست. وەلاممان بۆ ناردن، کە بڕۆن و گوندەکان چۆڵکەن، بەرەو چیای « شیرین » بڕۆن. ئەم هەواڵە، « مەلا مستەفا »ی جولاند. بڕیاریدا، ڕاستەوخۆ، بەشداریی لە شەڕەکەدا بکا. چی بکا؟ چاری نەما، شەڕەکە خۆی، بەرۆکی پێ گرت. « عەبدولکەریم »، شەڕی پێ فرۆشت و هێنایە نێو شەڕەکەوە. ئەگینا، « مەلا مستەفا » ڕاوەستابوو، بەشداریی

شەڕی نەدەکرد، ئەو بۆردومانە و ئەو کەرێتییەی کرا، ئەوە « مەلا مستەفا »ی هێنایە شەڕەکەوە.
– بەڵام، وا بزانم، تا ئەو کاتەش، « پارتیی »، هەر دژی شەڕ بوو. هیچ جۆرە، بەرنامەیەکی بۆ شەڕکردن نەبوو؟
بەڵێ. بەرنامەی بۆ شەڕکردن نەبوو. ئینجا، ئێمە بەرنامەمان دانا. کۆبوونەوەکەی مانگی « سێپتێمبەر »مان، لە « ئۆکتۆبەر »دا کرد. لە گوندی « عەوالان » کۆبووینەوە. لەوێ، کۆنفرانسێکمان کرت. بڕیارماندا، پشگیریی شەڕ بکەین و یاداشتێکیش، بۆ « عەبدولکەریم قاسم » بنێرین.
– ئەمە هەمووی، لە کۆتایی ساڵی « 1961 »دا بوو؟
بەڵێ. هەروەها، بڕیارماندا، داوا لە هێندێ ئەفسەر و برادەرانی « بەغدا »مان بکەین، پێوەندییمان پێوە بکەن و بێن بۆ لامان و هاوکارییمان لەگەڵ بکەن. ناوی « پێشمەرگە »شمان، بۆ چەکدارەکانمان هەڵبژارد. بڵاومانکردەوە، کە ئەم شەڕەی ئێمە دەیکەین، شەڕی پەلاماردان نییە، شەڕی خۆپاراستن و داکۆکییکردنە.
لەو کاتانەدا، حوکوومەتی « عێراق »، لە شارەکاندا، دەستی بە ئازاردانی خەلک کردبوو. ئێمەش، لە نێو شارەکاندا، ڕێکخستن و هێزمان هەبوو. هێندێ لە برادەرانیشمان، کە هێشتا ڕای « پارتیی » بە تەواویی، بەرانبەر شەڕەکە ئاشکرا نەبووبوو، بە قسەی « مەلا مستەفا »، دەستیان بە چالاکیی نواندن کردبوو. بۆ نموونە: لە زۆر جێ، ئەندامەکانمان کەوتبوونە گەڕان، بۆ ئەوەی، هێزی چەکدار دروسکەن، لەشکر دامەزرێنن، لە نێو هێزی پۆلیسدا، ئەندام و دۆستمان زۆر هەبوو. هەموو ئەوانە، کەوتبوونە خۆ. « شارباژێر و پێنجوین .. تاد » لە سەر ئەوە مابۆوە، فەرماندەرکەین، دەستی بە سەردا بگرن.
« مەلا مستەفا »، هەواڵی بۆ ئێمە نارد، کەوا، لە ناوچەکەی خۆیاندا، خۆی پێ ناژێنرێ، دەبێ، بارکا و بڕوا. چونکە، هەموو هۆزەکان، دژی وەستاون، بە تەنیا، دەرەقەتیان نایەن. داوایکردبوو، هێزی فریاخەین، تا لەو شەڕانە بیپارێزین. ئێمەش، دەوروبەری « 60 - 70 » کەسێکمان بۆ نارد. هێندێ لەو کەسانە، ئەو ئەفسەر و پۆلیسانە بوون، کە لە « چوارتا و پێنجوێن »ەوە، بە چەکی خۆیانەوە، بۆ لای ئێمە هاتبوون و بووبوون بە پێشمەرگە، ناردمانن بۆ لای « مەلا مستەفا »، تا، بیپارێزن و بۆ لای « ڕایات » بیەڕێنەوە. تا ئەو کاتە،

لەو ڕووەوە، هیچ ناکۆکییەکمان، لەگەڵ « مەلا مستەفا »دا نەبوو. ئێمە وەک « پارتیی »، لە سەر بڕیارەکانی خۆمان دەڕۆشتین، هەموو بەڵێنەکانی خۆمان، جێبەجێکردبوو.
- بەڵام، ئێوە وەک ئەندامانی سەرکردایەتی « پارتیی »، لە « بارزانیی »یەوە، زۆر دووربوون. ماوەیەکی زۆر لە یەکدی دابڕابوون.
ئاخر، ئەوەبوو، پێوەندییمان تەنیا، بەو جۆرە لەگەڵی هەبوو. بۆ نموونە: نامەیەکمان بۆ دەنووسی، وەڵامیدەدایەوە. ئەگینا، شتێکی وامان لە نێواندا نەبوو.
- مەبەسم ئەوەیە، ئەندامانی پەلیتبیرۆ، لە تەنیشت « بارزانیی »یەوە نەبوون، تا، لە نزیکەوە، بیروڕا ئاڵوگۆڕکەن و ئاگاتان لە یەکدی بێ.
نەخێر. کەس لە تەنیشت « مەلا مستەفا »وە نەبوو. لە دواییدا، « عەلی عەسکەریی و عومەر دەبابە »مان نارد، لەو ناوچەیە کاربکەن.
- وەک من ئاگاداربم، بەڕێزتان لە « بەغدا »وە، بەرەو « سولەیمانیی »، بە هۆی چەن برادەرێکی خەڵکی « سولەیمانیی »یەوە، بە جێبێ گەڕانەوە. کاتێ، لە نزیکەوە ئاگاداریی بارودۆخەکە بوون، هەموو دەنگوباسەکانتان بە تەواویی بیست، بەو بارودۆخە ڕازیی نەبوون. دژی ئەوە بوون، شۆڕش دەسپێبکا. گرفتەکانی نێوان حوکوومەت و کورد، بە شێوەیەکی ئاشتیخوازانە چارەسەرکرێ. « نووریی شاوەیس »یشتان، بۆ لای « عەبدولکەریم قاسم » ناردەوە. لە هەمان کاتیشدا، بڵاوکراوەیەکتان دەرکرد، بۆ ئەوەی، خەڵکەکە بڵاوەی لێ بکەن. ئایا، ئەو دەنگوباسانە ڕاستن؟
نەخێر. هیچ جۆرە بڵاوکراوەیەکمان، بۆ بڵاوەپێکردنی خەڵک دەر نەکردووە. چونکە، دەمانزانی، بۆ ئێمە شتێکی باش نییە. بە تایبەتیی، دوای ئەوەی، لە بیستوسێی مانگدا، « عەبدولکەریم قاسم » مۆڵەتەکەی « پارتیی » کێشایەوە. « عەبدولکەریم» لەو ڕۆژەدا، بە بۆنەی کردنەوەی بەستی « دەربەندیخان »ەوە قسەیکرد. ئێمە چاوەڕوانی ئەوەمان دەکرد، بێ بۆ « سولەیمانیی ». بڕیارمان دابوو، دژی ئەو، بۆمبا بتەقێنین، بە پێچەوانەوە، ئەو ئاشتیخوازییەی، ئێمە پیشانمان دابوو، دوای ئەوەی، « عەبدولکەریم » مەرجەکانی ئێمەی، پەسەند نەکرد، وامان بڕیاردا، بە جۆرێکی دیکە، هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەین. بڕیارماندا، گەر بێ بۆ « سولەیمانیی »، بە ساغیی نەگەڕێتەوە.
- نیازی وابوو، سەر لە « کارگەی جگەرەی سولەیمانیی » بدا.

بەڵێ. لەوێ، شتێکمان بۆ ئامادەکردبوو. ئێمە، خۆمان کۆدەکردەوە، ئەو جۆرە شتانە بکەین. بەڵام، ئێمە بە ئاشکرا، دژایەتیی ئەومان نەدەکرد.
ـ بەڕێزتان، ساڵی چەند، نێو شارتان بەجێهێشت و چوونە شاخ؟
لە دوای کۆنفرانسەکەی « عەوالان »، بەرەو « مالوومە »* بەڕێکەوتم. لە سەرەتای ساڵی « 1962 »دا، چووین بۆ « مالوومە » و لەوێ، نیشتەجێبووین. ئەشکەوتێکی لێ بوو، « پیربابەکر »یان پێ دەووت. ئێمە، ناومـــــان نابوو « پیـرمـام ». وەک ئێسگەش، « هەروامـان »ـان پێ دەووت. ئەو کاتە، بێتەلیکمان هەبوو.
ـ لەو ماوەیەدا، « پیرمام »، وەک بنکەیەکی پەلیتبیرۆ وابوو. بەڕێزتان و زۆربەی ئەندامانی سەرکردایەتی « پارتیی »ش، لەوێ گیرسابوونەوە. ئایا، پێوەندییتان لەگەڵ « بارزانیی »، وەک سەرۆکی « پارتیی » چۆن بوو؟
بەردەوام پێوەندییمان هەبوو.
ـ بەڵام، یەکدیتان نەدەبینێ؟
نەخێر. یەکدیمان نەدەبینی. چونکە، ماوەکەی نێوانمان، زۆر دووربوو. ئێمە، بۆ ئەوەی، پێوەندییەکە لە نێوانماندا، بەهێزتربێ، چەند « هۆکیتۆکیی » و بێتەلێکمان دەسکەوتبوو، هێندیکیمان بۆ « مەلا مستەفا » نارد. بەڵام، بە سەربەستیی بیڵێم: « مەلا مستەفا » وایدەزانی، من بۆیە ئەمانەم بۆ ناردووە، تا فڕۆکەکانی دوژمن، جێیەکەی بدۆزنەوە. لەبەرئەوە، بۆ جێیەکی دیکەی نارد بوو، کە شەش کاژێر لە خۆیەوە دووربوو. هەموو جارێ، لەوێوە پۆستەیان بۆ دەنارد. لەبەرئەوە، شتێکی زۆر باش نەبوو، پێوەندییەکانمان زۆر کەمبوویەوە. لە ڕاستییدا، ئەو لەشکری خۆی دروسکردبوو. بە حساب ئێمەش، لەشکری خۆمان دروسکردبوو. ئێمە دەمانویست، لەشکرەکەمان بە ڕاستیی، لەشکر بێ. نەک، وەک هێزێکی خێڵەکیی وابێ. تەنانەت، دوای کۆدەتاکەی « 1963 »، گەورەترین ناکۆکییمان، لەگەڵ « پارتی کۆمۆنیستی عێراق »دا هەبوو، زۆرترینی، لە سەر ئەوە بوو، ئێمە ڕازیی نەبووین، لەشکری تایبەتیی، سەر بە « پارتی کۆمۆنیست »، لە « کوردستان »دا هەبێ. ئێمە، پێمان وابوو، کە دەبێ، تەنیا، یەک « لەشکری یەکگرتووی کوردستان » هەبێ، هەمــــوو « پێشمەرگەی کوردستان » پێکەوە، لەو لەشکرەدا ئەندام بن.

---

* « مالوومە »، گوندێکە لە ناوچەی « شارباژێڕ »، لە پارێزگەی « سولەیمانیی ».

پ5 : دوای ئەوەی، بە دووروودرێژیی، باســی پێوەنییەکانی نێوان، خۆتان و « بارزانیـی »تان کـرد، دەتوانن، بە چەند خـاڵێکی کـوورت، هۆی سـەرەکیی ناکۆکیی و دووبەرەکییەکەی ساڵی« 1964 »مان بۆ دەسنیشانکەن؟

و5 : بەڵێ. دەتوانین، ئەو کارە بە ئەنجامبگەیەنین. من، لە مانگـــــــــی « سێپتێمبەری/1963 »دا، چووم بۆ « ئەوروپا »، کە کۆدەتاکە کرا.

ـ مەبەستتان لە کۆدەتاکەیٚ « 17/ نۆڤەمبەری/1963 » یە؟

بەڵێ. کۆدەتاکەی « عەبدولسەلام عارف »، کە دژی « بەعسیی »یەکان کردی. من، ئەو کـاتە لە « ئەوروپا » بووم. ووڵات بـە ووڵات دەگەڕام. لەوێ، خـەریکی ئەوە بووم، تا، یارمـەتیی بۆ شۆڕش و گەلـی کورد پەیدابکەم. هـەتا، کــۆتایی « 1963 » لەوێ بووم. ئامادەییەکی زۆرم بینیی. بە تایبەتیی، پارتە چەپەکان دەیانویست، یارمـەتیی گەلی کورد بدەن. کە ئەو هەواڵەم بیست، ویستم، بە پەلە بگەڕێمـەوە. ساڵەکەی سـاڵێکی سەیربوو. سـاڵێکی سـەختی ناخۆشبـوو. من گـەڕامــەوە بۆ « تاران ». کـاک « عـومـەر دەبابە »، خـوا لێی خـۆشـبێ، نەخـۆشـبـوو، بۆ چارەسـەرکـردن، هاتبـوو بۆ « تـاران ». ویسـتـمـان، پێکەوە بگەڕێینەوە. بەڵام، بەفرێ دەسـیپێکرد، کـەس نەیدەتوانی، هـاتوچۆبکا. لەگەڵ ئەوەشــدا، ئێـمــە هـەر ووتمان: دەڕۆین. سـواربووین، هـاتین، تا گـەیشـتـینە گـوندێ، لام وایە، « ئیـمـانـان »ی پێ دەڵێن. پێش ئـەوەی، بگەیتـە « سـەقـز »، لەوێ، لە بەر بەفـر، سیـازدە ڕۆژ مـاینەوە. گـەر چی، حـوکـوومـەتی « ئێران »، بلدۆزەریشـی لەگەڵ ناردبووین، تا، لە پێشمانەوە بڕوا و ڕێیەکەمان بۆ خاوین کـاتەوە. ئێمـە، لەوێ بووین، بە هۆی ڕادیۆوە بیستـمان، کە گفتوگۆ، لە نێوان حوکـوومەت و « مەلا مسـتەفا »دا هەیە. پێش ئەوەش من دەمـزانی، گفتوگۆ لە نێوانیاندا هـەیە.

ـ چۆن؟

چونکە، لە « بەرلینی ڕۆژاوا » بووم، لە سـەر داواکاریی « کامـەران بەدرخان » ویسـتم، بچم بـۆ « ئەمێریکا ». پێشـتـر ئەو چوو بوو بـۆ « ئەمێریکا ». لەوێ، پێـیـان ووتبـوو: ئێـمـە، تۆ بە نوێنـەری « پارتیی » نـازانین، یا دەبێ، « مـەلا مستـەفا » بێ، یا دەبێ، « برایم ئەحـمـەد » بێ. کۆمـەڵێ نامەی « سیناتۆر » و ئەندامـانی « کـۆنگرێس »ی پێ بـوو، هەمـووی دامێ. پێی ووتم: هەڵێکە و لە کیسی مـەدە، دەبێ بچی. منیش، وەک دەڵێن: مۆڵەتم وەرگرتبوو، کە دەتوانم، بە سەربەستیی بجوڵێمەوە و هەرچی دەکەم، بیکەم.

- مۆڵەت لە کێ؟
بێ گومان، لە « مەلا » نا. مۆڵەتم لەو جێیانەی، لەو کاتەدا، بەلای منەوە، جێی باوەڕبوون، وەرگرتبوو، کە لەگەڵ « ئیسرایل » نەبێ، لەگەڵ هەر کەسێ، هەر لایە، پێوەندییبکەین، قەیناکە، بە مەرجێ، تەفرە نەخۆین،
- دەتوانین، بزانین، ئەو جێیە کوێ بوو، کە جێی باوەڕی بەڕێزتان بوو، یا، نهێنییە؟
تازە ڕۆیی، ئەو جێیە، « سۆڤێت » بوو. ئینجا، کە من چووم بۆ باڵوێزخانەی « ئەمێریکا » و بلانکێتم پڕکردەوە و داوای ڤیزەم کرد، پێیان ووتم: دوای دە پازدە ڕۆژی دیکە، وەڵامەکەیت بۆ دێتەوە. لە ئوتێلەکە دانیشتبووم، هەمووی هەشت نۆ کاژێری پێ نەچووبوو، تێلێفونیان بۆ کردم، ووتیان: سبەینێ، وەرە بۆ لای « کۆنسوڵ ». بەیانیی، چووم بۆ ئەوێ. کابرای لێپرسراو هات و لە لامەوە دانیشت، دەسیکرد بە قسەکردن، ووتی: ئێمە، پێمان خۆشە، تۆ بچی بۆ « ئەمێریکا »، بەڵام، لەم کاتەدا نا. چونکە، ئێمە ئێستە، خەریکی ڕێکخستنی « مەلا مستەفا » و حوکوومەتی « عێراق »ین. گەر لەم کاتەدا، ئەوان بزانن، تۆ دەچی بۆ « ئەمێریکا »، دیارە، هەوڵوتەقەلاکەی ئێمە، کارێکی ئەوتۆی نابێ، پێمان دەڵێن: ئێوە دووسەرە ئیشدەکەن. لەبەرئەوە، چاکتر وایە، تۆ لێرە بمێنیتەوە و نەگەڕێیتەوە، تا بزانین، ئەم هەوڵدانەی ئێمە، بەچی دەگا.
بۆیە، من دەمــــــزانی، ئەو گفتوگۆ و هەوڵدانە، لە ئارادا هەیە. گەر چی، « ئێرانیی »یەکان بیستبوویان، بەڵام، بە منیان نەووت. وا دیاربوو، ئەو ڕێککەوتنەیان، بە دڵ نەبوو! بەڵام، حەزیاندەکرد، من بگەڕێمەوە. لەبەرئەوە، یارمەتییان دەداین، « بلدۆزەر »یان بۆ هێناین، تا، لە پێشەوە بڕوا و بەفری سەر ڕێگەکانمان بۆ لابەرێ. دوایی، چارمان نەما، ووتمان: هەر دەبێ، بڕۆین، « بلدۆزەر »ی دیکەیان بو ناردین و کەوتنە ڕێپاککردنەوە.
بە کورتیی: هەر چی چۆنێ بوو، گەیشتینەوە کوردستانی لای خۆمان. لەوێ بیستمان، کەوا « مەلا مستەفا »، لەگەڵ حوکوومەتی « بەغدا » ڕێککەوتووە.
باشە، ڕێککەوتووە، بەڵام، لە سەر چی ڕێککەوتوون؟ « شێخ ئەحمەد »ی برای، بڵاڤۆکێکی بڵاوکردبۆوە، نووسیبووی: ئاڵۆزوماڵۆز مەکەن، هەر کەس بچێتەوە ماڵی خۆی، حوکوومەت باشە و دادپەروەرە.
- ئایا، لەو کاتەدا، « شــــــێخ ئەحمەد »، هیچ سیفەتێکی دیاریکراوی، لە « پارتیی » یا شۆڕشدا هەبوو؟

نه له « پارتیی » دا و نه له شۆڕشدا، هیچ سیفەتێکی فەرمیی نەبوو، هەتا بڵێی، پیاوێکی بێ دەنگ و بێ زیان و بێ وەی بوو.

ـ کەواتە: ئەو بڵاوکراوەیەی، بە چ سیفەتێ بڵاوکردبۆوە؟

نازانم، ڕەمبێ، وەک سەرۆک هۆزی « بارزان » بڵاویکردبێتەوە. بەڵام، وەک گەورەی کوردێ، نەیکردبوو. ئەم بڵاوکراوەیەی « شێخ ئەحمەد » بڵاوکرابۆوە، بەبێ ئەوەی، گەلی کورد، هیچی دەسکەوتبێ. تەنیا دەیانووت: حوکوومەت بەڵێنیداوە، شتمان بۆ بکا! تەنانەت، دەستووری تازەی « عێراق »ی نوێیان دانابوو، بە هیچ شێوەیە، ناوی کوردی تێدا نەبوو! ئەو خاڵەی باسی کوردیشی، لە دەستوورە کۆنەکەدا کردبوو، بە تەواویی لایان بردبوو!

من چووم بۆ « سەنگەسەر »، بۆ لای « مەلا مستەفا ». دوای قسە و باس و هەواڵپرسین، هاتینە سەر ئەوەی، چۆن و بۆچی، لەگەڵ حوکوومەتدا ڕێککەوتوون. « مەلا مستەفا » ووتی: من وەک سەرکردەی « لەشکری کوردستان »، وەک سەرۆکی « پارتیی »، وەک سەرۆکی گەلی کورد، مافی ئەوەم هەیە، بڕیاربدەم، شەڕبوەستێ یا نەوەستێ، ڕێککەوم یا ڕێک نەکەوم. ووتم: وەڵڵا، تۆ وەک سەرۆکی کورد و سەرلەشکریش، قەیناکە بڕیاربدەی، بەڵام، وەک سەرۆکی « پارتیی »، بۆت نییە، بڕیاربدەی، شەڕبوەستێ یا نەوەستێ. ووتی: من سەرۆکی « پارتیی »م. ووتم: لە کاتێکدا، ئێمە، ئەندامانی سەرکردایەتی « پارتیی »، پازدە کەس ڕایەکدەردەبڕین، حەوت کەس لەگەڵ بێ و حەوت کەسی دیکە دژبێ، ئەوا، ئەو کاتە، تۆ لەگەڵ کام لا بی، دەنگی ئەو لایە وەردەگیرێ. ووتێ: مانای وایە، من پارسەنگم. ووتم: نەخێر. تۆ پارسەنگ نێت، تۆ سڵاوی. ووتی: کەواتە، تۆش دەسبەسەریی. ووتم: لە کوێ؟ ووتی: لێرە. ووتم: قەیناکە، دەسبەسەرم، هیچێ تێدا نییە. کەواتە، پێیان بڵێ، نانمان بۆ بێنن. چونکە، من دەرەنگ گەیشتبووم، ئەوان، نانیانخواردبوو. لە پاشان، بوو بە هەرا، خەڵک لە « قەلادزێ »وە، خۆپیشاندانیانکرد، خەریکبوون، بێن بۆ « سەنگەسەر ». دوایی، ئیزنیدایین. بە خێرێ، بەرەڵڵا بووین! ئێدی، لەگەڵ کاک « عومەر »دا، بە پشتی چیای « ئاسۆس »دا، بۆ شوێنی خۆمان گەڕاینەوە.

پاشان، کۆنفرانسێکمان گرت، لە کۆنفرانسەکەدا، بڕیارماندا، « مەلا مستەفا »، لە دەسەڵاتی سەرۆکی « پارتیی »ی ڕووتکەینەوە.

ـ مەبەستت، کۆنفرانسەکەی « ماوەت »ە؟

بەڵێ. تەنانەت، نامیلکەیەکیشمان، لە سەر گفتوگۆکە دەرکرد، « أصلح أم أستسلام ... »، بڵاومانکردەوە. بۆچی ئێمە، دژی ئەو ڕێککەوتنە دەوەستین.
دوایی، بیستمان، « مەلا مستەفا » دەیەوێ، پەلامارمانبدا. ئێمەش، دەسپێشکەرییمانکرد. « عەلی عەبدوڵلا و شێخ عەزیز »مان، بۆ لای « مەلا مستەفا » نارد، تا، هەموو شتێکی تێ بگەیەنن. بەلام، ئەو، بە هیچ شێوەیە، لەگەڵیان ڕێک نەکەوتبوو. بەڵکوو، هەر دووکیشیانی، لای خۆی گلدابۆوە، بڕیاریشدابوو، ئەویش، کۆبوونەوەی خۆی بکا و هێرش بکاتە سەرمان.
« مەلا مستەفا »، لە « ڕانیێ » بوو. ویستبووی، لە « ڕانیێ » کۆنگرەیەک بگرن. هێشتا، شەڕ لە نێوانماندا دروس نەبووبوو. ناوبژیکار، لە هەموو لایەکەوە هاتبوون و تێکەوتبوون، کە دیسانەوە ئاشتبینەوە. دوای نامیلکە بڵاوکردنەوەکەش، جارێکی دیکە، داوایان لە من کرد، بچم بۆ لای « مەلا مستەفا ». تەنانەت، « هەباس ئاغا » خۆی، بە دوامدا هات. منی لەگەڵ خۆی، بۆ لای « مەلا مستەفا » برد. چووین، لەگەڵ « مەلا مستەفا » دانیشتین و قسەیەکی زۆرمان کرد. بڕیارماندا، شەڕ لەگەڵ یەکدی نەکەین. بزانین، داواکارییەکانی « عێراق » چییە؟ « مەلا مستەفا »، ڕازییبوو، کۆمەڵێ داواکاریی بنووسم و بۆ حوکوومەتی بنێرین. لە سەر قسەی کۆمیتەی ناوەندیی و پەلیتبیرۆ، هێندێ داخوازییم نووسیی و ناردمان بۆ حوکوومەت. حوکوومەتی « عێراق » بڕیاریدا، چەند نوێنەرێکی دەوڵەت، بۆ گفتوگۆکردن بنێرێ، تا هەمووومان ببینین و قسەیان لەگەڵ بکەین.
لەو ماوەیەدا، ئێمەش، لە نێوان خۆماندا ڕێککەوتین، کۆنفرانسێ بگرین. لە هەموو لایەکەوە، ئەندامانی « پارتیی » بانگکەین. هەتا « حەبیب محەمەد کەریم » و ئەوانەشمان، وەک ناوبژیکار بانگکرد. بە تایبەتیی، ئەوان لە ئێشەکەشدا نەبوون، بێن و بە چالاکیی خۆیان هەوڵبدەن، ئەو کۆبوونەوەیە بکرێ و بەبێ تەرەفداریی خەڵک هەڵبژێرێ.
ـ ئەدی، مامۆستا « مەسعوود محەمەد »، چ ڕۆڵێکی، لە ئاشتبوونەوەی نێوان بەڕێزتان و « بارزانیی »دا هەبوو؟
لە نێوان پەلیتبیرۆ و « بارزانیی »دا، هیچ ڕۆڵیکی نەبوو. بڕواش ناکەم، بوو بێتی. گەر بووشیبێ، هی خراپیبووە، هی چاکی نەبووە. بەلام، گەر بیویستایە، ڕۆڵی چاک بگێرێ، دەیتوانی، ئەو کارەبکا. چونکە، « مەلا مستەفا »، زۆر بە قسەی « ئەمێریکا »ی دەکرد. پێی وا بوو، کە « مەسعوود »

سیخوڕی « ئەمێریکا »یە. پاش مردوو، ڕەحمەت باشە. « مەلا مستەفا »، خوا لێی خۆشبێ، لای وا بوو، هەر کەسێ هاتووچۆی، باڵوێزخانەیەکی بیانیی کرد، ئەوە بەکرێگیراوی ئەو وڵاتەیە. باڵوێزی هەر دەوڵەتێ، بە هەر کەسیکی ووت، پیاوی چاکە، وا دەزانێ، ئەو کەسە، سیخوڕی ئەوانە. ئێستە، کە من قسەتان بۆ دەکەم و ماڵم، تا ئێستە لە « لەندەن »ە، وای دەزانی، من بەکرێگیراوی « ئەمێریکا »م، سیخوڕی « بریتانیا »م، هی « ئێران »م! ئەویش، هەرگیز سیخوڕی نەدەکوشت. مەگەر، دەوڵەتەکان خۆیان پێیان بگووتایە، بیکوژە. وەک « کەمال عوسمان »، خۆی چاکتری دەزانی، کە سیخوڕی « ئەمێریکا »ش و « ئێران »یش و « عێراق »یشە. لە کاتێکدا، خەریکبوون، خانووی بۆ بدۆزنەوە، ماڵی بو دروسکەن، کووشتی. ئەگینا، سیخوڕی نێو دەوڵەتەکانی نەدەکووشت. جا، گەر « مەسعوود » پێی بووتایە: با ئەم ناکۆکیی و دووبەرەکییە نەمێنێ، نەئەما. بڕوام وایە، « مەلا مستەفا » هەوڵیدەدا، نەمێنێ. چونکە، ناکۆکییەکە لە ئێمەوە نەبوو. بۆ نموونە: ئێستە، « یەکێتیی »، چۆن هەوڵدەدا، شەڕ ڕاوەستێ، خۆ من خۆم لەوێ نیم، بەڵام، بڕوام وایە، ڕاستدەکەن. چونکە، خۆم ئەو شتانەم دیوە، خۆم بە « مەلا مستەفا »م وتووە، لە کاتێکدا، بەرانبەری سووکترین قسە، بە خۆت دەڵێی، خراپترین و سووکترین « هێن! » دەنێری، بۆ خۆت، ئەو وای دەزانی و وای لێکدەدایەوە، ئەوە فڕوفێڵە، لەگەڵیدا بەکاریدێنێ. دەیووت: ئەم زۆڵە، چەند زیرەکە. لە دڵی خۆیدا، ئەو حسابەی، بەو شێوەیە بۆ دەکردی!

لە کاتێکدا، « مەلا مستەفا » دەیویست، کۆنگرێسێ، بۆ خۆی و کۆمەڵەکەی بگرێ، من هێشتا، هەر لە « ڕانیێ » بووم. نامەیەکم دەسکەوت، بۆ نوێنەرانی « پارتیی » لە مەڕ خۆی ناردبوو، کە لە ناوچەی « بادینان »، گوێ بە قسەی ئێمە نەدەن، هەر لە سەر بەرنامەی، تایبەتیی خۆیان بڕۆن.

ئێنجا، نوێنەری حوکوومەت هات. نوێنەرەکان، بە سەرۆکایەتی سەرۆکی وەزیران، « تایەر یەحیا » بوو. ئێستەش، دۆسییەکانم لە لا ماوە، کە ناوی « مخابەرات »ی لە سەر نووسرابوو. ئەو دۆسییەیان، دا بە من بیخوێنمەوە، ئەو دۆسییەیە، ووتاری دەربارەی، ئەو مافانەی ئەوان، دانیپێدادەنێن و ئامادەن، لەگەڵمان ڕێککەون، تێدابوو. نوێنەرەکان هاتن و لەگەڵمان دانیشتن، دەسمان بە وتووێژکردن کرد. لە پێشدا، ئێمە کۆبوونەوەیەکمان کردبوو، هەموو داخوازییەکانمان تۆمارکردبوو. تومەز، « مەلا مستەفا » وتوویەتی:

)

ئەمانە داخوازییەکانی « پارتیی »ن، هی من نین. ئەندامانی پەلیتبیرۆ هاتن و دەمەتەقێکە، هەمووی لەگەڵ ئێمەدا بوو، لەگەڵ « مەلا مستەفا »، هیچ شتێ نەبوو. لە پاش نەختێ دانیشتن، بۆ خۆی چوو، لەو لاوە لێی دانیشت، نیشەکەشی، بۆ ئێمە بەجێهێشت. ئێمەش، لەگەڵ حوکوومەت ڕێک نەکەوتین. چونکە، هیچ شتێکیان بە کورد نەدەدا. تەنانەت، ڕازیی نەبوون، ناوی کورد، لە دەستووردا تۆمارکەنەوە. لەبەرئەوە، ووتمان: ئێمە ئەمە ناکەین. ئەو مەرجانە جێبەجێدەکەن، باشە، جێبەجێی ناکەن و شەڕ ناکەن، قەیناکە، ئێمەش، شەڕ ناکەین. بەڵام، ئێمە بەو شێوەیە، لەگەڵتان ڕێک ناکەوین، لەگەڵ ئەو ڕێککەوتنەش نین، کە لەگەڵ « مەلا مستەفا »دا، ئیمزاتانکردووە. ئێدی، ئەوان گەڕانەوە. بێ گومان، ئێمەش بۆ شوێنی خۆمان گەڕاینەوە.
هەموو هەواڵەکان، وایان دەگەیاند، کە « مەلا مستەفا »، هێزەکانی خۆی کۆ دەکردەوە، لە هەموو لایەکەوە، هێزی بۆ ناوچەکە دەهێنا. دەیانگووت: حوکوومەتیش، هێزی بۆ ناردوون. سەرۆک تیرە و هۆزەکانیش، لەگەڵ « مەلا مستەفا »دا بوون، کەوا، بە هەموویان بە گژ ئێمەدا بێن.
من، بۆ مێژوو دەڵێم: ئێمە، کە گەڕاینەوە، لە مانگی « ئۆگەست »دا کۆبوونەوەیەکمانکرد، تا، برادەران بیروڕای خۆیان، بەرانبەر شەڕکردن دەربڕن.
لە کۆبوونەوەکەدا، بیروڕای جیاواز هەبوو. برادەران دوودڵبوون. هێندێ دەیانووت: دەبێ، شەڕبکەین. هێندێکی دیکە، دژی شەڕکردن بوون. « مام جەلال »، یەکێ بوو لەوانەی، دژی شەڕبوو. ووتی: ئێمە شەڕ ناکەین. بەڵام، بڵاڤۆکێ بڵاودەکەینەوە، هەر « پێشمەرگە »یە دەیەوێ، بمێنێتەوە، با، بچێتە لای « مەلا مستەفا » و شەڕبکا. ئەویشی، لەگەڵ شەڕکردن نییە، با، بگەڕێتەوە ماڵی خۆی. « پارتیی » شەڕ ناکا و دەچینەوە دادەنیشین و خەباتی ڕامیاریی دەکەین. گەر ماوەیان داین، ئەوا، بە ئاشکرا کاردەکەین، گەر ڕێیان نەداین، ئەوا، وەک جاران، بە نهێنیی کاردەکەین.
هێندێ کەس، ئەو ڕایەی « مام جەلال »یان پێ باشبوو. هێندێکی دیکە، لەگەڵیدا نەبوون و داوای شەڕکردنیان دەکرد. تا، سەرە گەیشتە سەر خوالێخۆشبوو « نووریی شاوەیس »، ووتی: ئەوە ئێوە دەڵێن چی؟ بە شەرەفم، گەر هەمووشتان بڕۆن، من بە تەنیا شەڕدەکەم، « کلاشینکۆف »ێ لەگەڵ سندوقێ فیشەک، لە تەنیشت خۆمەوە دادەنێم، لە سەر پردەکەی « قەشان »

رادەوەسم، نایەڵم، یەک « جامانە سوور » بپەڕێتەوە، تا، گوللەم پێ مابێ، شەڕدەکەم، دوا گوللەشی، بە تەوقی سەری خۆمەوە دەنێم. هەموو خەڵکەکە، بەو قسانەی کاک « نووریی »، سەریانسووڕما! ووتیان: تۆ ئەوەندە ئازابی، ئێمە بۆچی، ئەوەندە نامەرد و ناپیاو بین، گەر پەلامارمانبدەن، ئێمەش، شەڕدەکەین. بڕیار درا، شەڕبکەین.

بەڵام، کە شەڕ بەرۆکی گرتین، شەرکەر بە « نووریی »شەوە نەما. تومەز، خێزانەکەی هەولی بۆ دابوو، مۆڵەتی بۆ وەرگرێ، بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکەی، بەرەو « سۆڤیێت » بڕوا. چونکە، ئەو بەسەزمانە، نەخۆشبوو.

لە کوێوە چوو بۆ « سۆڤێت »؟

لە « عێراق »ەوە. چونکە، ئەو کاتە، گفتوگۆ هەبوو، هێشتا، هیچ ڕوون نەبوو بۆوە، کێ شەڕدەکا و کێ نایکا، کێ ناپاکییکردووە و کێ نەیکردووە. کاک « نووریی » چوو بۆ ئەوێ، چارەسەری خۆی بکا. کەچیی، هەموو « ئەورووپا »ی لە « مەلا مستەفا » ووروژان. هەرچی ئێمە، بە « مەلا مستەفا »مان نەووتبوو، ئەو ئەوەشی پێ ووت. هەموو خوێندکارانی، دژی « مەلا مستەفا » هاندا و لە دەوری « پەلیتبیرۆ » کۆیکردنەوە. هەق وابوو، هەموو کەس دژبووایە، دژی ئەو ڕێککەوتنە بوونایە، کە لەگەڵ « عەبدولسەلام عارف » ئیمزایانکردبوو. چونکە، هیچ شتێکی بۆ کورد تێدا نەبوو. حوکوومەتیش لاوازبوو. « نووریی شاوەیس »، پڕوپاگەندەیەکی یەکجار زۆری، دژکردبوون. جا، خۆی پیاوێکی سەیربوو، تا بڵێی، پیاوێکی ئازابوو. بە ڕاستیی، لەو بڕوایە دام، گەر بمایایەتەوە، لە سەر پردەکە دادەنیشت، بە مەرجێ، خێزانەکەی نەگەیشتایەتە سەری. چونکە دەیتوانی، بیگۆڕێ، ژیرییشی ڕێکوپێکبوو، ئیشیدەکرد. بەڵام، یەک شتی دیکەی هەبوو، لەگەڵ کێ بژیایە، دەبوو بە هاوڕێی، ئێدی، تا ئەو پەڕی فیداکاریی، ئیشی بۆ دەکرد.

پاشان، بوو بە هەراوهوریا و شەڕ دەسپێکرد. کاتێکمان زانیی، من و کاک « عومەر »، لە شەڕەکەدا ماینەوە. برادەرانمان، ئەوانەی زۆر قایم نەبوون، دیار نەمان. زۆر کەس، ناپاکییان لەگەڵ کردین. بۆ نموونە: کابرایەک هەبوو، « سەعید مەسیفیی » پێ دەڵێن. ئەم پیاوە، لێپرسراوی ناوەکە بوو. ئەو ڕووبارەی بە کەڵەک، لەو بەرەوە بۆ ئەم بەر، لێی دەپەڕیتەوە.

ـ بۆ دۆڵی « سەفرە و زەروون ».

بەڵێ. ئەو، تا دوا کات، لەگەڵ ئێمە بوو. یەکێ بوو، لەو کەسانەی، پشگیریی شەڕکردنی دەکرد. کەچیی، لە باتی ئەوەی شەڕبکا، کەڵەکەکەی خومانی، بۆ ناردن، تا پێی بیەڕنەوە. بە دوو چەکدار دەیانتوانی، نەهێڵن، لەشکرێکی خێڵەکیی بپەڕێتەوە. چونکە، چی دەکەن، چوار تەقەیان لێ بکە، دەگەڕێنەوە، بیست کەسیان لێ بکوژە، رادەکەن. خۆ کەس ناتوانێ، بە مەلە بپەڕێتەوە. لەبەرئەوە، ئەوانە، هەموو ناپاکییان، بەرانبەر ئێمە کرد.
لە پێشدا، ئێمە بڕیارماندا، هەموومان بچین بۆ « ئێران »، بزانین، « ئێران » دەڵێ چی؟ ئەوە بوو، ئێمە لەو کەینوبەینەدا بووین، لە ناکاو هێزە چەکدارەکانی « مەلا مستەفا »، پەلاماریانداین، جێگەکانی ئێمەیان داگیر کرد، هێندێ « پێشمەرگە »ی ئازا و قوڕبەسەریان کوشت، مەکتەبەیەکی دەوڵەمەند و سەیرم هەبوو،« لوقمان » وەک « ئەسکەندەریە » سوتاندی.
ـ شەڕەکە، بە سەرکردایەتی « لوقمان » بوو، یا « عوبەیدوڵلا »؟
بە خوا، ئەوەی من بیستم، « لوقمان » گەشتبووە ئەوێ، « عوبەیدوڵلا » نەگەشتبوو. کاتی خۆی، « لوقمان » دیارتربوو.
ـ چونکە، « کریس کۆچێرا » نووسیووێتی: بە فەرماندەی « عوبەیدوڵلا » بوو.
بە خوا دەبێ، « لوقمان » بووبێ. چونکە، من بۆ مەکتەبە سووتاندنەکە و خەڵک ئازاردانەکە، « لوقمان »م بیستووە. « لوقمان » دڕبوو. « عوبەیدوڵلا » لە « لوقمان » هێمنتربوو.
پاشان، ئێمە ڕۆشتین بۆ « ئێران ». ئێدی، دوژمنایەتییەکە، بە تەواویی، ڕوویدا. لە پێش ئەوەی، « بەعس » دەسەلات بگرێتە دەس، ئێمە نەماندەزانی، « بەعس » کۆدەتادەکا. بە حسابی ئێمە، نەتەوەییەکانی عەرەب دەهاتن. چونکە، زۆر دژی « عەبدولکەریم » بوون. هەوڵیاندا، پێوەندیی لەگەڵ ئێمەدا پەیدابکەن. سووکە پێوەندییەکیان، لەگەڵ ئێمەدا دامەزراند. من خۆم چووم، نوێنەری « تایەر یەحیا »م بینیی. بە ناوی « تایەر یەحیا » و نەتەوەییەکانەوە قسەیدەکرد. ووتمان: ئێمە دژی ئێوە ناوەستین، بە مەرجێ، لە یەکەم بلاوکراوەتاندا، یا، لە دووەمدا، لە دووەم تێ نەپەڕێ، « ئۆتۆنۆمیی »، بە کورد بدەن. ئەو خاڵەی، دەربارەی کورد بوو، لە دەستوورەکەدا هەبوو، جارێکی دیکە، بخرێتەوە ناوی. ئێمە، لە سەر ئەمە ڕێککەوتین.
کە کۆدەتاکەی « 1963 » بوو، « سالح یوسفیی » و برادەرانی دیکە، لەگەڵ « عەماش » و ئەواندا، ڕێککەوتبوون. لەبەرئەوە، زوو پشگیرییانکردبوو. ئێمە

ڕاوەستاین، تا، دەنگوباسەکە بە تەواویی، ڕوونبۆوە، چاوەڕوانی ئەوەمان دەکرد، لە بڵاوکراوەکانیاندا، باسی کورد بکەن. هەتا، داوامان لە « مەلا مستەفا » کردبوو، بۆ وەزارەت کێ دادەنێ، دایبنێ، بۆ وەزارەتێ، کە دروس دەکرێ، دەبێ، چەند کوردێکی بە ڕێژەیەکی دادپەروەرانە تێدابێ. ئەمانەمان، هەموو کردبوو. ویستیان، لەگەڵ ئێمە گفتوگۆیکەن. ووتمان: نابێ، دەبێ، لە « مەلا مستەفا »وە دەسپێبکەن. « مەلا مستەفا »، بڕیاریدابوو، کۆنفرانسێ لە « کۆیە » ببەستێ، کۆنفرانسێکی گشتیی، نەک هەر تەنیا بۆ « پارتیی ». لەبەرئەوە، زۆر ژیرانە، گەلێ لە « ئاسووریی و تورکمان »ەکانی داوەتکردبوو. خەڵکێکی زۆری دیکەشی، بانگکردبوو. ئێمەشی نەک وەک نوێنەری « پارتیی» بەڵکوو، وەک ئەندامی بانگکراو داوەتکردبوو. کۆبوونەوە دەسپێکرد، قسە و باس زۆر کرا، ئاهەنگ و بەزم گێڕرا. هەتا، « هەژار »ی هۆنەری کوردیش، لەوێ بوو. قسەی کرد، قسەکانی، زۆر دژی حوکوومەت بوون. دژی هەموو شتێ بوون. قسەکانی سەیربوون، لەگەڵ بەرنامەی « مەلا مستەفا » ڕێک نەدەکەوتن. لەگەڵ ئەوەشدا، قسەی خۆی کرد.
هاتینە سەر ئەوەی، لەگەڵ « مەلا مستەفا »دا دانیشین و قسەبکەین، بزانین، چی بڵێین و چی نەڵێین؟ دیسان، لە سەر ئەوەی، چی لە حوکوومەت داواکەین و چی داوا نەکەین، لە نێوان ئێمە و « مەلا مستەفا »دا، جیاوازیی هەبوو. ئێمە ووتمان: ئەو مەرجەی داوامانکردووە، دەبێ، جێبەجێیکەن، بەڵام، « مەلا مستەفا »، لە سەر ئەو بڕوایە نەبوو. لە پاشان، کۆمەڵێ سەرۆک تیرە و هۆز، لە ماڵی « کاکە زیاد » دانیشتبووین، قسەکرا، سەرۆک خێڵەکان، وا دیاربوو، تێگەییبوون، کە لە نێوان « مەلا مستەفا » و « پارتیی »دا، ناکۆکیی هەیە، گەر چی، هێشتا بە تەواویی، نەتەقیبۆوە. چونکە، ئەمە ساڵی « 1963 »یە باسیدەکەم. ئاغاکان، پیشانیاندا، کە ناکۆکیی هەیە. « مەلا مستەفا »ش ووتی: باشە، ئێوە لە نێوانماندا دادوەر بن، گەر لەمەو لا، ناکۆکیی لە نێوان من و « برایم »دا هەبوو، چی دەڵێن، بیڵێن. ئەو وای دەزانی، ناکۆکییەکە، لە نێوان من و ئەو دایە. ووتم: بابە، جیاوازییەکە، لە نێوان من و تۆدا نییە، لە نێوان تۆ و پەلیتبیرۆ دایە. لەبەرئەوە، وا تێ مەگە. ووتی: با وا بێ. بەڵام، من هەر وا دەڵێم. بە ڕاستیی، بیرم نەماوە، « شێخ حوسێنی بۆسکێن » بوو، یا، « باپیر ئاغای بابەکر ئاغا » بوو، یەکێ لەو دووانە بوو، لە نێو دانیشتووەکاندا قسەیکرد، ووتی: ئێیجا قوربان! وەک من بزانم، ناکۆکیی ئێوە، لە سەر دوو

شته، له سەر چەک و پارەیە. جا، بۆیە دەبێ، ئێمە بزانین، پارە و چەکتان، لە کوێوە بۆ دێ؟ چەندتان بۆ دێ؟ چۆن خەرجیدەکەن؟ بڕوابکە، « مەلا مستەفا »، وەک دەرزیی بە دڵیدا کرابێ، ئاوا زەردبوو. دەستێکی بە چاویدا هێنا. ووتی: « برایم » تو خوا! ئەنگیی نییە، من و تۆ دادوەرمان لە نێواندا بێ؟ ووتم: وەڵڵا قوربان، تۆ دەیزانی، دادوەر هەبێ، یا ببێ، نەبێ، یا نەبێ. خۆت، چی بە باش دەزانی، ئەوە بکە. ووتی: خۆمان، گرفتی خۆمان چارەسەردەکەین. لەگەڵ ئەوەشدا، گرفتی نێوان ئێمە و « مەلا مستەفا »، نە پارە بوو، نە چەک بوو.

ـ واتە: ئەو قسەیە ڕاست نەبوو؟

نەخێر. هەرگیز ڕاست نەبوو. بە ڕاستیی، ئێمە، هەر لە سەرەتاوە، ئەو ڕێبازەی ئەومان، بە دڵ نەبوو. ئێمە، دژی ئەوە بووین، « پێشمەرگە »، بچێتە گوندێکەوە، بە شەق، « مریشک » بە خەڵکی گوندەکە سەربڕێ. ئێمە، « پێشمەرگە »مان دارکارییدەکرد، گەر داوای « مریشک »ی بکردایە. پێمان دەووتن: دوو شت هەیە، دەتوانن، داوایکەن، نان و ئاو! تۆ خۆت هاتووی، خەباتبکەی، کەس بە دویدا نەناردووی، ئەو خۆی، نان نییە، بیخوا. تۆش، داوای خواردنی باشی لێ دەکەی. چونکە، « عەبدولکەریم » لە سەرەتای هەراکەوە، ئابڵووقەیەکی ئابووریی کوردستانی دابوو. « ئێرانیی »یەکانیش، تازە ڕێیاندابوو، خواردن و کەلوپەل بێ. ناکۆکییەکە، نە لە سەر چەک و نە لە سەر پارە بوو. بە پێچەوانەوە، ئێمە پارەمان پەیدادەکرد و بۆ ئەوانمان دەنارد. لە هەموو ژیانیاندا، پاوەنێکیان بۆ ئێمە نەناردووە! خوا هەڵ ناگرێ، کە چوینە « ئێران »، « مەلا مستەفا »، یەک دوو جار، یارمەتییدام، کاتێ، لێمان قەوما و « ئێران »، پارەکانی بڕین، بە دوو جار، هەشت نۆ هەزار دۆلاری دامێ. ئەگینا، کاتی دیکە، هەرگیز، پارە لەوانەوە، بۆ ئێمە نەهاتووە، هەمیشە، ئێمە لە پارەی « پارتیی » و لەو یارمەتییەی، لە دەرەوە دەسمانکەوتووە، بۆ ئەوانمان ناردووە. لە سەر چەکیش نەبوو. بەڵام، ئەوان خۆیان دەیانویست، سەرۆک خێڵەکانیش نەزانن، ئەو ناکۆکییە، لە سەر چییە؟ ئەگینا، ئێمە خۆمان، هەمیشە ئامادەبووین، بۆ خەڵکی ئاشکراکەین، چەندمان هەیە.

ـ بە قسەکانی بەڕێزتاندا، وا دەردەکەوێ، هۆی سەرەکیی ناکۆکییەکەی ساڵی « 1964 »، بۆ گفتوگۆکەی نێوان « عەبدولسەلام و بارزانیی » دەگەڕێتەوە. ئایا، ئەمە تا چەند ڕاستە؟

نەک تەنیا، بۆ گفتوگۆکە، بەڵکوو، بۆ بەرژەوەندیی کوردیش دەگەڕێتەوە. ئایا، ئێمە شۆڕشمان بۆچی کردووە؟ شۆڕشمان، بۆ بەرژەوەندیی خۆمان کردووە، یا، بۆ بەدەسهێنانی مافەکانی گەلی کورد کردووە؟
ـ مەبەسم ئەوەیە، جیاوازیی دید و بۆچوون و ناکۆکیی ئایدۆلۆژییتان، لە نێواندا نەبووە.
نەخێر. شتی ئایدۆلۆژیی بوو. ئەو، بە شێوەیەکی خێڵەکیی دەجوڵایەوە. ئێمە، پارتایەتییماندەکرد. ئێمە، پێمان دەووت: تۆ مافی ئەوەت نییە، بە تەنیا بڕیار بدەی. ئەو دەیووت: نەخێر، من مافم هەیە، بڕیاربدەم.
ـ بەڵام، من مەبەسم ئەوە نییە. ئەوانە، هەمووی شێوەی کارکردنە، زیاتر پێوەندیی، بە کێشەی « دێمۆکراسیی » و « دیکتاتۆریی »یەوە هەیە. مەبەسم لە شتی ئایدۆلۆژیی ئەوەیە، بیروباوەڕتان جیابووبێ. بۆ نموونە: ئەگەر ئێوە، « مارکسیی » بووبن، ئەو « نەتەوەیی » بووبێ!
ئێمە، هەقی ئەو شتانەمان نەبوو. ئێمە، « ئۆتۆنۆمیی »مان دەویست، بڕوا بکە، هەموو حوکوومەتەکان، لە ئێمە « سۆسیالیست و کۆمۆنیست »تر بوون! ئێمە، داواکارییەکانمان ئەوانە نەبوو. ئەو خۆشی نەیدەزانی، چی دەوێ، شتێکی دیاریکراوی نەبوو، داوایکا. چونکە، لەو گفتوگۆ و ڕێککەوتنانەی، ئەو دەیکردن، هیچ بەرهەمێکی نەبوو! بۆ نموونە: لە « **1964** »دا، لەگەڵ حوکوومەت ڕێککەوت، هیچیشی دەس نەکەوت. کەچیی، کەسیش پێی نەدەگووت، « **چاش !** » برادەرانی ئێمە، لە « **1966** »دا، گوایە: لەگەڵ میرییدا ڕێککەوتن. من، لەوێ نەبووم، هێشتا، لە « تاران » بووم. زانکۆی « سولەیمانیی » کرایەوە. نەورۆز، بە جێژنێکی نەتەوەیی ناسرا. ناوی کورد و کوردستان دەهاتەپێشەوە. کەچیی، سەرەڕای هەموو ئەمانەش، هینەکەی ئێمە بوو بە « **جاشیی** » و هینەکەی ئەو بوو بە « **باشیی** » !
ـ با، ئەوەیان بۆ پرسیارێکی دیکە هەڵگرین.

پ6 : هێندێ سەرچاوەم، دەربارەی ئەو دووبەرەکییە خوێندۆتەوە. زۆربەیان، وا پیشاندەدەن، کە ناکۆکییە سەرەکییەکە، لە نێوان « برایم ئەحمەد »ی نووسەر و سکرتێری « پارتیی » و سەرۆک « بارزانیی »دا بووە. بۆیە، « بارزانیی » بەوە ڕازییبووە، گەر « برایم ئەحمەد »، وازبێنێ و دانیشێ، یا، لە « پارتیی » دەرکرێ، ئەوا، گرفتەکان کۆتاییپێدێ و « جەلال تاڵەبانیی »ش

دەکا بە سکرتێری « پارتیی ». لەوانە: « کریس کۆچێرا و دێڤید ئادەمسۆن » باسیدەکەن. « هەژاری موکریانیی »ش، لە ژیننامەکەی خۆیدا و لە پاشەکیی « شەرەفنامە »دا باسیکردووە. هەروەها، مامۆستا « مەسعوود محەمەد »، لە « گەشتی ژیان »ەکەیدا، بە شێوەیەکی نهێنیی، باسیکردووە. بەڕێزتان، لەو ڕووەوە دەڵێن چیّ؟

و6 : گەر « مەلا مستەفا »، سکرتێرێکی بۆ « پارتیی » ویستبێ، ئەو سکرتێرە، « شێخ عەزیز » بووە. بە پێچەوانەوە، هەرگیز، « مام جەلال »ی نەدەکرد بە سکرتێر. بەڵام، بەرلەوەی « مام جەلال » ببێ بە زاوای من، بە سێ چوار ساڵیش ویستی، بە لای خۆیدا ڕایکێشێ. تەنانەت، نامەکەی بۆی نووسیبوو، بووبوو بە هۆنراوە. « جەلال »ە چی و چی، وەرەوە لام، وەرەوە لام. ئەوە لە کاتێکدا، ئەو نامەیەی بۆ ناردبوو، « مام جەلال » سەرپەرشتیی لەشکرەکەی « پارتیی » دەکرد، یەکێ بوو لەو کەسانەی، گەر شەڕبکرایە، دەبوو ئەو سەرکردایەتی بکا. وە هەر ئەویش، لەگەڵ هێزی « مەلا مستەفا »دا شەڕیکرد. « مام جەلال » خۆشی، ئەوەی نەدەویست. لای منیش، خۆشترین شتبوو، گەر بمزانییایە، ئەو بەوەی من ڕزگاریدەبێ. چونکە، « مەلا مستەفا »، وای دەزانیی، من ئەوم. من ئەو نیم و ئێستەش، ئەو نیم. ئەوەی « مەلا مستەفا » لای وا بوو، دەبێ، ئەوە وا بێ، لای من وا نەبوو. ئەو خەڵکەش، بۆیە بە قسەی منیاندەکرد، چونکە، من گوێم لە قسەی ئەوان دەگرت، ڕاکانی من، کوورتەی هەڵبژاردەی دید و بۆچوونەکانی ئەوان بوو، لە ڕێکخستنەکە زیاتر، بیروڕای تایبەتیی خۆم، هیچی تێدا نەبوو. من ڕێکخەر بووم، لەوەی زیاتر لێپرسراوبووبم.

ـ مەبەستم لەوە نییە، « مام جەلال » ڕازیبووبێ، یا نەبووبێ، هەر وەک سەرچاوەکان باسیدەکەن، « بارزانیی » وای دەویست.

« مەلا مستەفا »، هەرگیز، ئەوەی پیشان نەداوە. سەرچاوەکان، لە کەمیی زانیارییەوە، ئەوە دەڵێن.

ـ دەشێ، وابێ. وا دەردەکەوێ، لە دووبەرەکییەکەدا، شتی کەسێتییشی تێدا بووبێ.

نازانم، لە لایەن ئەوەوە هەبووبێ، لە لایەن منەوە نەبووە. چونکە، من، تا مردیش، هەر ڕێزم لێ دەگرت. هەر دەمویست، دڵێ ڕاگرم. بەڵام، ئەو وا تێگەیەندرابوو، کە ئێشەکەی ئەو، بە منەوە سەر ناگرێ. ئێشەکەی منیش،

ئەوە بوو، ئەو دەیویست، لای « ئەمێریکا » بگرێ. لە کاتێکیشدا دەیویست، لای « ئەمێریکا » بگرێ، هەر لە فرۆکەکەوە، کە سواربووین و گەڕاینەوە بۆ « عێراق »، منی ڕاسپارد، لای « ئەمێریکا »ی بۆ بگرم، لە یەکەم هەنگاوەوە، کە تۆزێ سەرکەوتین، ووتی: تۆ ئێدی مەیکە، بەسە، لەوە زیاتر پێویستمان پێ نییە. ئەمەی بە من ڕەوا نەبینی، تا کۆتایی پێم بکا.

پ7 : ئایا، پێوەندیی نێوان « ئێران و پارتیی »، پێش پێوەندیی نێوان « ئێران و بارزانیی »یە؟

و7 : پێوەندیی نێوان « ئێران و پارتیی » ؟!! ئێمە نازانین، کەی پێوەندیی، لە نێوان « ئێران و بارزانیی »دا دروستبووە. ئایا، پێوەندییەکە، لە پێش ساڵی «1961» بووە، یا، دوای ئەو ساڵە بووە؟ ئەوەمان ئاگا لێ نییە. بەلام، دوای ئەوەی، شۆڕش دەستپێکرد، بیستمان، لای « پێنجوێن »ەوە، دەوڵەتی « ئێران »، لەشکری هێناوەتە سەر سنوور. « پارتیی » ویستی، لەگەڵ ئەو لەشکرەدا، پێوەندیی پەیداکا و پێیان بڵێ: ئێمە، دژی ئێوە نەهاتووینەتە ئێرە، بۆ ئەوەی، شەڕ لەگەڵ ئێوەدا بکەین. ئێمە، لە « عێراق »دا گرفتی تایبەتیی خۆمان هەیە. چەند جار، هەوڵماندا، پێوەندییبکەین، بەلام، پێوەندییەکان سەری نەگرت و لە هیچ ڕوویەکەوە، سەرکەوتن بە دەس نەهێنرا، چ لە لایەن ئێمەوە، کە هێندێ لە ئەندامان ڕازیی نەبوون، بیانبینن، چ لە لایەن ئەوانەوە، کە ئامادە نەبوون، دانیشتنەکە لە ئاستێکی بەرزدا بێ. یا، پەیمانێکی ڕاستت بدەنێ و جێی باوەڕبێ. بۆیە، ئەو هەوڵدانە پشگوێخرا و بڕایەوە.

ـ بەلام، بەڕێزتان فەرمووتان: من، لە ڕێی « ئێران »ەوە چووم بۆ « ئەورووپا ». ئاخر، لەو « ئێران »ەوە چووم، کە لەگەڵ « مەلا مستەفا » و ئێمەدا، پێوەندیی هەبوو.

ـ واتە: دوای ئەوە بووە.

بەڵێ. من یەکەم جار، لە سەر داواکاریی « مەلا مستەفا » چووم بۆ « ئێران ». چونکە، کاتێ پەلیتبیرۆی « پارتیی » ویستی، پێوەندیی لەگەڵ « ئێران »دا ببەستێ، خوالێخۆشبووان « عەلی عەسکەریی و عومەر دەبابە »یان نارد، هەر لە « بان »ەوە، پێوەندییان لەگەڵ « تاران »دا کردبوو. « ساواک »ی ئەوێ، پێیان ووتبوون: چاوەڕێبکەن، وەلامتان لێ دەگێرینەوە. لە پاش هەفتەیەک، وەلامیاندابوونەوە، کە بمێننەوە، ڕاسپاردەیان هەیە،

ڕاسپاردەکەیان، چی بوو؟ « شا » دەفەرمووێ: « مەلا مستەفا »، هیچی بە دەس نییە، هەموو شتێ، بە دەس « پارتیی »یە. « پارتیی »ش « ڕێکخراوێکی کۆمۆنیستیی »یە، لەبەرئەوە، بڕوا ناکا و چۆن دەبێ، یارمەتیی « پارتێکی کۆمۆنیستیی » بدا؟ گەر ئەلێ، وا نییە، با، « برایم ئەحمەد » خۆی بێ، چاوی بە « شا » بکەوێ. یەکەم جار، کە من چووم بـــــــۆ « ئێران »، لە مانگی « سێپتێمبەری/1962 »دا بوو.

– ببورە، بۆچی چووی؟

« مەلا مستەفا »، داوای لێ کردم، وەلامی بۆ من نارد، بچم بۆ « ئێران ». ووتم: من ناچم. پەلیتبیرۆ، کۆبوونەوە و ووتیان: دەبێ، بچی. ووتم: ناچم. من هەمووی، چەند مانگێ لەوە پێش، لە وەلامی نامەیەکی « ئیحسان نووریی »دا، سێ ووتارم، لە « خەبات »دا نووسیبوو، هەزار قسەم، بە « شا » وتبوو، کە نەدەچووم، وەنەبێ، لە ترسا بوویێ، بەڵکوو، ڕووم نەدەهات، بچم و بیبینم. من دەمزانی، گەر بچم، بانگم ناکا و بمکوژێ. جارێکی دیکە، « سمایل خان » ناکوژێتەوە. ووتم: وەک پیاوێ، کە بڕوام بە « سۆسیالیزم » هەیە، وەک خاوەن بیروباوەڕێ، نامەوێ، بیبینم. ئەگینا، واز لە ئەندامێتی کۆمیتەی ناوەندیـــی و « پارتیی »ش دێنم.

« مەلا مستەفا »، نامەیەکی بۆ ناردم، نازانم، چی لێ بەسەرهات، وەک هەموو شتەکانی دیکەمان، تێداچوو! پێی وتبووم: تۆ پڕوپاگەندەی کوردایەتیی دەکەی، دەڵێی: لە پێناوی کوردا، خۆم بە کوشتدەدەم، ئەمە هەمووی ڕاست نییە. گەر ڕاستدەکەی و بەرژەوەندیی کوردت دەوێ، هەموو یارمەتییەک، کە بۆ کورد دێ، لە سەر ئەوە وەستاوە. ئەو پیاوە، تۆ ببینێ، بزانـــــــێ، تۆ « کۆمۆنیست »ی، یا « کۆمۆنیست » نیت. گەر ڕاستدەکەی و کوردی، فەرموو بچۆ. « شێخ عەزیز »یش هاتبوو بۆ لام، کە ئەویش، ئەندامی پەلیتبیرۆ بوو. هەروەها، ئەویش قسەکانی « مەلا مستەفا »ی بۆ گێڕامەوە، ناچاربووم، بچم. چووم بۆ « ئێران »، « شا » ببینم. نەخێر، « شا »شم نەدی. ئەوەش، باسێکی دوورودرێژە.

– بەڵێ، ئەوەیان باسێکی دیکەیە.

بەلام، هەموو دەسکەوتەکەمان ئەوە بوو، سەد هەزار دینارێک و دە پازدە تفەنگیان دایێ. هەموویمان هێنا و بیست هەزارێکیمان بۆ خۆمان لێ هەلگرت و ئەوی دیکەشمان، بۆ ئەوان نارد. کێ دەڵێ، « مەلا مستەفا »،

باوەڕی بەوە کردبوو، کە ئەو پارەیە، هەمووی ئەوەندە بووە؟ ئەو، بڕوای بەوە نەدەکرد، بەلام، ئێمە وەک پەلیتبیرۆی « پارتیی »، یەکێ ناتوانێ، بە ئارەزووی خۆی، دەسکاریی ئەو پارەیە بکا، بەبێ ئەوەی، لێپرسراوی دارایی ئاگای لێ بێ. ئەو دەتوانێ، بڕیاربدا، ئەو پارەیە چی لێ بکرێ. دەبێ، « زوبیحیی » بزانێ، ئەو پارەیە، چی لێ دێ، گەر « زوبێحیی » نەیزانێ و من دەسکارییمکرد، بە دزم دادەنێن. هەر واشە، دزییە.
گرفتێکی دیکەش هەبوو، ئەو قسەیەی « شا » کردی، تەنیا، بۆ ئاگرنانەوە بوو، نەک، لە بەر پیاوەتیی بووبێ. گەر وا نەبووایە، کە من چووم، دەیبینیم. گەر کاریکی هەبووبێ، یا، لە بەر هەر هۆیەکی دیکە بووبێ، ئەو شەوە نەیبینیم، شەوێکی دیکە دەیبینیم. من نزیکەی، مانگێ لەوێ مامەوە، ئەدی، بۆ نەیبینیم؟!! دەزانی بۆ؟ بۆ ئەوەی جارێکی دیکەش بتوانێ، بە « مەلا مستەفا » بلێ، دۆستەکەی تۆ « کۆمۆنیست »ە و جارێکی دیکەش، دووکەرتمانکا. بەلام، بەداخەوە، من درەنگ هەستم بەوە کرد، گەر چی، ژیرییشم پێ بشکایە، ئێستە، بە تۆی دەلێم: هیچ چارم نەبوو، نەمدەتوانی، لەوە زیاتر بکەم، بۆ « مەلا مستەفا »یەک، کە قبوولی نەکردبێ. چونکە، « شا » مەبەسی ئەوەبوو، پارچەپارچەمانکا، « تورک »ەکان دەیانویست، لەتوپەتمان کەن، ناوی « کۆمۆنیست »یش، بەهانەیەکی باشبوو، بۆ پارچەپارچەکردنمان.

پ8 : ئایا، ئەم لایەنانەی خوارەوە، تا چەن، دەسیان لە دروسکردن، یا، قووڵکردنەوەی دووبەرەکییەکەدا هەبوو؟
پ : سەرانی حوکوومەتی « عێراق ».
و : زۆر.
پ : « ئێران ».
و : زۆرتر.
پ : « تورکیا ».
و : زۆر.
پ : ڕۆژاوا بە تایبەتیی « ئەمێریکا ».
و : « ئەمێریکا »، لەبەرئەوەی، دۆستایەتیمان، لەگەڵ « ڕووس »دا هەبوو، دەسێکی زۆری لەو دووبەرەکییەدا هەبوو. بەلام، دوای ئەوەی، لە سەر داواکاریی « مەلا مستەفا »، چووم بۆ باڵوێزخانەکەیان و پێوەندییم پێوە

کــــردن، بیـــرورِایان بەرانبـــەر « پارتیی » گــۆرِا. لەبەرئەوە، لە نامـــە نهێنییـــیەکانیاندا دەیانووســیی، رۆژنامــەی « خــەبات »، رۆژنامــەیەکی نیشتــمانیی کوردەکانە. ئەو « خــەبات »ەی خــەڵکی دیکە، پێیان دەگــووت: رۆژنامــەیەکی « کۆمۆنیســتیی »یە! ئەوەی نەیدەهێشت، بە تەواویی، رای خۆیان بگۆرِن، « مــەلا مستــەفا » بوو. ئەویش، بە هۆی ئەو سیخورِانەوە، کە هەیبوون.

ــ مــەبەست دوویەرەکییەکەی ساڵی « 1964 »ە. ئایا، « ئەمــێریکا » لەو کاتەدا، رۆڵی خراپیان هەبوو؟

تەنیا رۆڵێکی خراپیــان هەبوویێ، ئەوەبوو، هەوڵیاندەدا، « مــەلا مســتــەفــا » لەگــەڵ حــوکــوومــەتی « عــێــراق »دا رێککەوێ، لە ترسی ئەوەی، نەوەک بزووتنەوەی گەلەکەمان، لەگەڵ « رووسیا »دا رێککەوێ، چونکە، نامەیەکیان دا بە من، ووتیان: ئەمە رای « ئەمێریکا »یە. رای « ئەمێریکا »ش، ئەوەبوو، گوایە: لای ئەو دەوڵەتانەی کوردیان لە ژێردەسـدایە، « Good service »ی خۆیان بە کاردێنن، کەوا، لەگەڵ کوردا باشبن، مافیانبدەنێ و وەک مرۆڤێ بژین. لەوە زیاتر، هیچ شتێکی دیکە نەبوو.

پ : بەرەی رۆژهەلات، بە تایبەتیی، « یەکێتی سۆڤێت »ی هەڵوەشاوە، لەو دوویەرەکییەدا، بە خراپە دەوریان هەبوو؟

و : دەوری خراپیان نەبوو.

پ : « پارتی کۆمۆنیستی عێراق » .

و : خراپبوون.

پ : کاژیک.

و : خــۆیان شــتێ نەبوون، بایەخــێکیــان نەبوو، تا، رۆڵی خــراپیــان هــەبوویێ. ئەندامــەکــانی « پارتیی » خــۆمــان، ئەو کــەســانەی « بادینــان »، کــە ســەر بە دوژمن بوون، لە دواییشــدا بوون بە « جــاش »، هەر لە « عەزیز عــەقــراویی و شەوکەت عــەقراویی و هاشم عەقراویی ... تاد » بەڵگەم هەیە، رۆڵی خراپیــان، لەو ناکۆکییەدا بینی. بەڵام، رۆڵی هیچ لایەک، وەک رۆڵی دەوڵەتەکان نەبوو.

پ : رۆڵی سەرۆک تیرە و هۆز و دەرەبەگەکانی کوردستان، لە ناکۆکییــەکەی « 1964 »دا چی بوو؟

و : دەوریان هەبوو.

ــ لە دروسکردنیدا یا لە قووڵکردنەوەیدا؟

له قوولکردنەوەشیدا، زۆر ڕۆڵیان هەبوو. چونکە، ئەوە زیاتر، لە بەرژەوەندیی ئەوان بوو. بە تایبەتیی، ئێمە پارەمان نەبوو. کە لە « قەلادزێ » ویستمان، ڕاکەین، هێندیکیان لەوانەی، لەگەڵ هێزەکەی « مەلا مستەفا » هاتنەسەرمان، بە ئاشکرا، پێیان ووتم: شتێ پارمەتییمانبدەن، ئێمە، لەگەڵ ئێوە دەبین.
ـ دەکرێ، ناوەکانیان بزانین؟
نەوەڵلا، ناوەکانیانم بیر نییە.

پ9 : دوای ئەوەی، ناکۆکییەکان، بە تەواویی خەستبۆوە، ســــەرکردایەتی « پارتیی »، کە ئێوە بوون، لە سەرۆکی « پارتیی ـ بارزانیی » دابڕان، هەر وەک پێشتریش باسمانکرد، فاکتەری جوگرافیا، ڕۆڵێکی گرنگی بینی، لەبەر ئەوەی، لە یەکدییەوە دووربوون، هاتوچۆ و دانیشتنتان، لە نێواندا نەبوو، لە کوردستاندا، ئەو توانایەی ئێستە هەیە، ئەو کاتە نەبوو، وەک « تێلێفۆن، هۆکیتۆکیی و فاکس »، تا هەموو پێوەندییەکان، ڕاستەوخۆ بە پەلە بکرێ، نەدەتوانرا، بە شێوەیەکی ئاشتییانە، ئەو کێشەیە، لەگەڵ « بارزانیی »دا چارەسەرکەن، پێش ئەوەی، ڕێی « ئێران » بگرنەبەر؟
و9 : ئیمکان نەبوو، هەر چی کورد هەیە، خەریکبوو، نەیاندەزانی، « مەلا مستەفا » چی لێت دەوێ! گرفتەکە ئەوەبوو، هەر وەک داوەکەی ئێستە وایە. ئێستە، « جەلال تاڵەبانیی » ئامادەیە، بێ و دوور لەو پچێتە گۆڕەوە، بە مەرجێ، ئەو شەڕە نەمێنێ. بەڵام، کەس پێی ناڵێ، چی بکا. نازانن، چییان دەوێ! بۆ نازانن؟ چونکە، داواکارییەکانیان، لە بنەڕەتدا، هی خۆیان نییە. من ئێستەش، لەو بڕوایەدام، ئەمە ئاگرێکە، تازە هەڵگیرسێنرا، لە 100٪یش، لەوەی کۆن دەچێ.
ـ بەڵێ. دوایی، دێینە سەر ئەو پرسیارەش.

پ10 : دوای ئەوەی، لە « ئێران » گەڕانەوە، بێ گومان، سووکە پەیمانێ، جۆرە ئاشتییە، لە نێوان ئێوە و « بارزانیی »دا هەبووە، بۆیە گەڕاونەتەوە. ئایا، نەتاندەتوانی، زەمانێکی هاویەش، لەگەڵ « بارزانیی »دا بدۆزنەوە، بە کۆنفرانسێ، کۆنگرەیە بگرن، تا، هەرچی ناکۆکییەکانی نێوانتان هەیە، یەکجاریی پاکتاویکەن و نەیهێڵن، بۆ ئەوەی جارێکی دیکە، دووبارە نەبێتەوە؟
و10 : جا، تۆ ڕاوەستە، لەوە گەڕێ. من، کە لە مانگی « ئۆگەستی1966 »، لە

« ئێران » گەڕامەوە بۆ « عێراق »، هاتنەوەکەی من، بۆ ئەوەبـــــوو، لەگەڵ « بارزانیی »دا ڕێککەوینەوە. بۆ ئەوە نەبوو، شـــەڕ لەگـەڵ « بارزانیی »دا بکەین. خەڵکم نارد بۆ لای، لەوانە « سمایل شاوەیس »، یەکێ بوو، لە هەرە چالاکەکان، کـە هەوڵیدەدا ناوبژیمانبکا. هەتا، « شاکیر فەتاح » و ئەو کوردانەی دیکەش، کە حەزیان بەو ناخۆشیی و شەڕە نەدەکرد، هەوڵێکی زۆریان دا، ناوبژیمانبکەن و ڕێکمانخەنەوە. « ئێران »یش، بەو نیازە ڕازیی بوو، کە بگەڕێمەوە، بۆ ئەوە نەبێ، پێوەندییەکەمان لەگەڵ « عێراق »، بە هێز بکەین. بەڵکوو، بۆ ئەوەبوو، « مەلا مستەفا » بەهێزکەین و پشتیبگرین. بەڵام، « مەلا مستەفا »، گوێی بەوە نەدا، دەرفەتی نەداینێ.

بە پێچەوانەوە، ئێمە پێمانووت: لە فڵانە جێێن، پەلاماری ئەوێ مەدە، پەلاماری دوژمن بدە. گـەر ئێمـە، پەلامـارمـان دای، گـەر لەگـەڵ حـوکـوومـەتدا، بەشداریـیمان لەو شـەڕەدا کـرد، هەڵبـەتە، ئێمـە ناپاکین. چونکە، ئێمـە بۆ پارێزگاریـیکردنی حـوکـوومـەت نەهاتووین. حـوکـوومـەتێ، پێویسـتی بە پارێزگاریـیکردنی ئێمە هەبێ، نابێ، بژی. ئێمە، بۆیە چەکمان پێیە، خۆمانی پێ دەپارێزین. چونکە، لە ژیانی خۆمـان دڵنیـا نین. کـەچیی، ئەو دەهات، لە پێشـەوە تەقـەی لە ئێمـە دەکرد، یەک کەسی، لە دوژمن نەدەکوشت. برادەری دلسۆز و پاک و مرۆڤی باشی وەک « عەلی حەمدیی و ئەحمەد عەبدوڵڵا ... » چاکترین ڕۆڵەی کورد و زیرەک و ئازا، لە شەڕی براکوژییدا تیداچوون. ئەو شـەڕەی، ئێـمـە بە هەمـوو نرخێ، ئامـادەبووین، بیبـڕێنینەوە. کەچیی، هەر نەدەبڕایەوە و نەدەبڕایەوە، نازانم بۆ؟

ـ ئاگادارم لەوەی، ئەندامانی پەلیتبیرۆ، لە « ئێران » زووتر و بەڕێزیشتـان درەنگتر گەڕانەوە. بەڵام، مەبەسی پرسیارەکەی من ئەوەیە، ئـــەوان، لەگەڵ « بارزانیی »دا، لە ســـەر چی ڕێککەوتبـــوون، وا لە « ئێـــران »ەوە، بۆ نـاو کوردستان گەڕانەوە؟

ئەوان لە « ئێران » ڕێککەوتن، بگەڕێنەوەو لەگەڵ « مەلا مستەفا » ڕێککەونەوە، ببینەوە بە پارتەکەی جاران و هیچ جیاوازییە نەمێنێ. بۆ ئەو مەبەسەش، خۆی نوێنەری ناردبوو، سێ کەس بوون، « سالح یوسفیی، نووریی شاوەیس » و نازانم، کێی دیکەیان لەگەڵ بوو. لە نزیک « تەوەکەل »، یەکدیمانبینیی. قسەمانکرد و ڕێککەوتین، کە هەموو بگەڕێنەوە، هەر من نەگەڕێمەوە.

ـ واتە: ناکۆکییەکە، لەگەڵ بەڕێزتان بووە؟

بەڵێ. ووتم: بە سەر چاو، من ناگەڕێمەوە. ئەوانی دیکە هاتنەوە. بەڵام، هیچ ڕۆڵکیان نەبوو، تا دوایی، « مام جەلال » و ئەوان، کە ڕایانکرد، لەبەر چی بوو؟ « مام جەلال » و ئەوان، لە « دۆڵەڕەقە »، لە ماڵی « هەباس ئاغا »، دەسبەسەربوون. وەڵام لە « مەلا مستەفا »وە، بۆ « هەباس ئاغا » دێ، کە بیاننێرێ، لە بندەسی « ئیدریس »دا بن. یا، لە ژێر چاودێریی یەکێکدا بن.
« هەباس ئاغا »ش، کە ئەم وەڵامەی بۆ دێ، نایەوێ، لێپرسینەوەی مێژوویی هەڵگرێ، بە « مام جەلال و حیلمی عەلی شەریف » دەڵێ: ئەمە هەواڵەکەیە، بە دەس خۆتانە، دەچن، بچن، ناچن، دەبێ، لێرە بڕۆن و نابێ، لێرە بمێنن. ئەوان دەترسان، لەوەی بیانکوژێ. بێ گومان، دەکوژران. چونکە، خەڵکی لەوان ئازیزتر کوژرابوو. کە دەبینن، چار نییە، لە شارەکاندا نایەڵن، بژین، لە « سولەیمانیی »، ئەندامی « پارتیی » کۆنیان دەکوشت. ئەوانیش، ئەندامی پەلیتبیرۆ بوون و دەترسان، لەبەرئەوە، ئەوان ڕادەکەن و دەچن بۆ « بەغدا ». چاریان نەما، دەبوو، لەگەڵ حوکوومەت ڕێککەون. کە منیش گەڕامەوە، پێم چار نەکرا. چونکە، بە هیچ شێوەیە، ئامادە نەبوون، ڕێککەون، نازانم، چییان دەویست؟!!

پ11 : لەبەر ڕۆشنایی، ئەو پرسیارەی پێشوودا، پرسیارێکی دیکە، لەدایک دەبێ. ئایا، کە زانیتان، بە هیچ شێوەیە ناتوانن، زمانێکی هاوبەش، لەگەڵ « بارزانیی »دا بدۆزنەوە، بۆ ئەوەی، لە شۆڕشەکەشدا، وەک جاران بەشدار بن، چاکتر نەبوو، چەک فڕێدەن و دەس بە خەباتی ڕامیاریی بکەن، وەک لەوەی، لەگەڵ دەوڵەتی « عێراق »دا ڕێککەون و چەک دژی « بارزانیی » هەڵگرن؟
و11 : ئەو حوکوومەتانەی هەبوون، ئێمکان نەبوو، ڕێی ئەوەت بدەنێ، بە سەربەستیی، کاربکەی. خۆ ئێمە، خەباتی ڕامیارییشمان پێ نەدەکرا، مافی ئەوەمان نەبوو، بە فەرمیی، ڕۆژنامەمان نەبوو، تا، دەریکەین و بڵاویکەینەوە، بە ئاشکرا، پارتێکی ڕامیارییمان نەبوو. هەرچەندە، حوکوومەت خۆی دەیزانی، ئێمە پارتین، بەڵام، دانی بەوەدا نەدەنا، کە ئێمە پارتێکی ڕامیارین، تا، بارەگا بکەینەوە و لافیتە هەڵواسین، ئەو هەقەمان نەبوو. لەبەرئەوە، دەبوو بە حوکوومەت بڵێین، لەگەڵ تۆم، دەبوو لەگەڵ ئەو کەسە بێ، کە یارمەتیتدەدا.
بەم شێوەیە، بردمانە سەر، تا « بەعس » هات. ئەو کاتە، هێندێ شت گۆڕا.

پاشان، « مەلا مستەفا » دەیکووشتین، گەر ئەو نەمکوژێ، من دەچمەوە، لە شارەکەی خۆم دادەنیشم. بۆ لە« بەغدا » دادەنیشم؟ کوردایەتیی لەوێ ناکرێ.
ـ بەڵێ. من مەبەسم ئەوە نییە. بۆ نموونە: سەرکردایەتیی دەیتوانی، لە نێو شۆڕشدا بمێنێتەوە، یا، لە شوێنێکدا دانیشێ، یا، کوردستان بەجێبێڵێ و بڕوا بۆ دەرەوەی وولات. بەڵام، ڕێکخستنی « پارتیی »، لە نێو شارەکاندا، بە نهێنیی هەر بەردەوام بووایە.
بە هیچ شێوەیە نەدەکرا. دەبوو، لەگەڵیان بی. چونکە، ئەندامانی « پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران »یان دەکووشت. لەبەرئەوەی، لەگەڵیان نەبوون.

پ12 : ئەو ماوەیەی، نێوان سالانی « 1966-1970 »، چۆن هەڵدەسەنگێنن؟ پەند و ئامۆژگارییەکانی، لای بەڕێزتان چین؟
و12 : وەڵڵا من، بۆ بەدبەختیی، زۆر بڕوام بە پەند نییە. یەکێ لە هۆی، دواخستنی نووسینی بیرەوەرییەکانم ئەوەیە. بڕوام بەوە نییە، مرۆڤ پەند وەرگرێ. مرۆڤ پەند وەرناگرێ.
جارێ، لە دانیشتنێکدا، دەربارەی کۆماری « مهاباد »، قسەماندەکرد، منیان بانگکردبوو، بیروڕای خۆم دەربڕم. جارجار، خەڵکی گێرەشێوێن، دێنە ئەو کۆبوونەوانە و دەیانەوێ، تێکیدەن. من و کاک « حەمە رەسووڵ هاوار » قسەماندەکرد، کاک « حەمە » هۆنراوەیەکی خوێندەوە. پاشان، من قسەمکرد. یەکێ هەستا و مژێکی لە جگەرەکەی دا و ووتی: بێ قەزا بی، ئەوەی تۆ فەرمووت، هەمووی لە پەرتووک و مێژوودا هەیە، ئێمە، شتێکمان دەوێ، مرۆڤ پەندی لێ وەرگرێ. تۆ، لەو شتانەمان بۆ باس بکە. ووتم: چیت بۆ باسکەم؟ تۆ، چیت دەوێ؟ خەڵکەکە، داوایانکرد، وەلامیبدەمەوە و بێ دەنگی کەم. منیش، چاوم گێڕا، نازانم، وەک شتێ، چی بە مێشکمدا هێنای، ووتم: من، بڕوام بەوە نییە، مرۆڤ پەند لە شت وەرگرێ! قاقا دەسیکرد بە پێکەنین. زۆر کەسی دیکەش، لە پێکەنینەکەدا، بوون بە هاوبەشی. ووتیان: چۆن وا دەڵێی؟ مرۆڤ، چۆن پەند وەر ناگرێ؟ ووتم: وەڵڵا، ئەوە بڕوای منە. دیسانەوە، خەڵکەکە پێکەنین. ووتم: کاکە! پێکەنینی ناوێ، ئەوە لەو دیوارە نووسراوە، « No Smoking » ، جا، لەو کاتەدا، کە من ئەو قسەیەمدەکرد، سەیری منی دەکرد، مژی لە جگەرەکەی دەدا و پێدەکەنی. ووتم: لە جگەرەکەی خۆشت نووسراوە، تووشی « شێرپەنجە »ت دەکا و دەتکوژێ، کەچبی، پەند لەمە

وەرناگری، ئێستە دەتەوێ، پەند لە قسەکانی من وەرگری، کە باسی ڕووداوەکانی « 30 - 40 » ساڵ، لەمەو پێشت بۆ دەکەم؟ ئەو ڕووداوانەش، بە بیستن بیستوومە، یا، خوێندومەتەوە. ئەوڕۆ، جیهان گۆڕاوە، دەوڵەتەکان گۆڕاون، بیروڕا گۆڕاوە، هەموو مرۆڤەکانیش گۆڕاون. ئەم پەندە گران و بە نرخەی، بەڕێزتان دەتانەوێ، وەریگرن، چییە؟ وەڵڵا، کاتێکمان زانیی، کابرا ونبوو، خەڵکەکە، کەوتنە چەپڵەلێدان.
بڕوا بفەرموو، گەر کورد، پەندی لە یەک ڕۆژی ئەو سی ساڵەی، نێوان ساڵانی « 1964 - 1994 » وەرگرتایە، ئەم ڕۆژەمان، بە چاوی خۆمان نەدەدی. بە تایبەتیی، سەرکردەکانمان، ڕۆحیان لە شەڕ دەچێ. ئەو « مام جەلال »، کاتێ سەرکردەی لەشکرەکەمان بوو، زراوی لە شەڕکردن چووبوو. بۆ؟ چونکە دیویەتی، ئەو شەڕی براکوژییە، چی بە سەر کورد دێنێ. ئەوڕۆش، هەر هەمان کارەسات، دووبارەدەبێتەوە، کە لە شەڕەکانی ئێمەدا ڕوویدا. لە شەڕەکانی پێشووی ئێمەدا، شەڕکەر دەکوژرا. لە هەموو ئەو شەڕانەدا، ڕەنگە، سەد کەسی بێ گوناح نەکوژرابێ.
ـ مەبەستت لە بێ گوناح چییە؟
بێ گوناح، واتە: شەڕنەکەر. ئەوانەی کوژران، هەموو چەکهەڵگر بوون، هەموو لە کۆڕی خەباتدا کوژرلن، هەموویان خۆیان، ئەو ڕێیەیان هەڵبژاردبوو. بە پێچەوانەوە، ئێستە، شەرمەزارییشمان بە سەردا دێ. لەگەڵ ئەوەشدا، ئێستە، پەندی لێ وەرناگرین!
ـ بەڵێ. ڕاستە، بە داخەوە، نەتەوەی کورد، پەند لە مێژوو وەر ناگرێ. بەلام، گەلانی دیکە، پەندیان لە مێژووی خۆیان وەرگرتووە. ئەگینا، چ پێویستدەکا، مێژوو تۆمارکرێ؟ ئێمە، لێرەدا نامانەوێ، پەل بۆ نێو زەریای، ئەو باسە بهاوێژین. بەلام، من مەبەسم ئەوەبوو، ئەو سەردەمەی « 1966 »، کە ناکۆکییەکە، لە نێوان باڵەکەی پەلیتبیرۆ و « بارزانیی » دا، زیاتر قووڵبۆوە، چۆن هەڵیدەسەنگێنن، بە چاک یا بە خراپ؟ لەو ماوەیە پەشیمانن، یا، پەشیمان نین؟ بە تایبەتیی، کە ئێوە لە جێیەکی دیکەدا بوون؟
من دەڵێم: لەو ڕۆژەوە، دەسم بە کاری ڕامیاریی کردووە، پەشیمانم. دەمتوانی، نووسەربم. دەمتوانی، هۆنراوە بڵێم. دەمتوانی، شتێ بکەم، بەرێکی هەبێ، ئەنجامێکی هەبێ. بەلام، نەء، گەر ژیان، بۆ دواوە بگەڕێتەوە، هەرگیز، بە هیچیدا ناڕۆمەوە.

پ13 : ڕاتان بەرانبەر، ڕێککەوتننامەکەی « 11/مارسی/1970 » چییە؟ کاتی خۆی، ئەو سەرکەوتنە مەزنەتان، چۆن هەڵسەنگاند؟
و13 : بۆ ئەوەی، ئەوەت باشتر بۆ ڕوونکەمەوە، چۆنمان هەڵسەنگاند، لەو کاتەی، ڕێککەوتننامەکەی، تێدا بڵاوکرایەوە، من لە « لەندەن » بووم. تووشی نەخۆشییەکی زۆر خراپ ببووبووم. یەکێ دەیووت: دڵە! یەکێکی دیکە دەیووت: شێرپەنجەیە! لە سەر حسابی، حوکوومەتی « عێراق » هاتم بۆ « لەندەن »، بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکەم. خانوویان، لای باڵوێزخانەی « عێراق »ەوە بۆ گرتبووین. هەموو ڕۆژێ، داوەتیاندەکردین و هەواڵیان پێ ڕادەگەیانین. بە هۆی باڵوێزخانەوە بیستم، گفتوگۆ هەیە. ئەوەبوو، وتووێژکرا و سەریگرت.
هەمووی مانگێکی پێ نەچووبوو، « پەژمان »
ـ « عیسا پەژمان » ؟
بەڵێ. لە « ئێران »ەوە، هات بۆ لام بۆ « لەندەن ». چۆن منی دۆزییەوە؟ زۆر ئاسانبوو. چونکە، هەموو « ئێرانیی »یەکان دەیانزانیی، من لە کوێم. چۆن دەیانزانیی؟ بەوەی کە « موحسین حەکیم »یشیان، بۆ ئەو جێیە هێنابوو، کە منی لێ بووم. ئەویش نەخۆشبوو. بێ گومان، هەرچی « شیعە » هەبوو، دەهاتن، بۆ بینینی، دەیانپرسی، کێ لە ئوتێلەکەیە؟ شوێنی باشە، یا نا؟ جێگەکەی مەترسی لێ دەکرێ، یا نا؟ لە بەر ئەو هۆیانە، پرسیاریاندەکرد.
« پەژمان » پێی ووتم: حوکوومەتی « ئێران »، زۆر پەشیمانە لەوەی، لە «1964»دا، لایەنی ئێوەی نەگرت، لایەنی « مەلا مستەفا »ی گرت. ئێستەش دەیەوێ، جارێکی دیکە، پەشیمانیی خۆیتان، بۆ دووپاتکاتەوە، سزای خۆشی، لەو پەشیمانییە وەرگرت. لەبەرئەوەی، ئێوە کوردایەتیی دەکەن و دەتوانن، ڕۆڵێکی گەورە ببینن، گەر ئێوە، لە سەر خەباتی خۆتان ئامادەبن، « شا »ی « ئێران » ئامادەیە، هەموو شتێکتان بۆ بکا. ووتم: هیچ شتێکت پێیە، وەڵامەکەی من بنووسی. گەر ڕاستیکردبێ، ووتی: وەڵڵا ناوێرم، قسەکانی تۆ بنووسم. چونکە، دەترسم، لێم وەرگرن و گوێیان لێ بگرن. ئێشەکەمان، لێ تێکچێ و منیش هەڵواسن. تۆش، ژیانت خراپبێ. لەبەرئەوە، پێنووس و شتەکانی دیکەشم، لەگەڵ خۆم نەهێناوە. ووتم: هیچی دیکەت پێ نییە؟ ووتێ: نە. ووتم: باشە، بە دەمی پێیان ڕاگەیەنە، بچۆرەوە، بە « شا » بڵێ، ئەو مافەی ئەورۆ کورد، لە « عێراق »دا دەسیکەوتووە، ئەو دەتوانێ، بە کوردەکانی « ئێران »ی بدا؟ ووتم: ئێمە لە « 1964 »دا، داوامانکرد، کوردی « ئێران »،

ئەو مـافەی بدرێتێ، کـە کوردی « عێـراق »، لە سەردەمـی « پاشایەتیی »دا بوویەتی. « شا »، ئەوەی بە دەسخستنە نێو کاروباری « ئێران » حسێبکرد و ووتی: « برایم ئەحمـەد، جەلال تاڵەبانیی و عومـەر دەبابـە »، لە « پارتیی »دا، چییـان بە دەسـتـە؟ زۆر دوور نەڕۆین، سـبـەینێ، « پارتیی » کـۆدەبێـتـەوە و دەڵێن: ئەمـانە ناپاکبـوون، دەریانکەن، پیـاوی « شا »ن و هیـچـیـان نامـێنن. بەڵام، « مەلا مستەفا »، هەموو ڕۆژێ دەتوانێ، سێ هەزار پیاوی چەکدار، لە دەوری خۆی کۆکاتەوە، هیچیشی، لە من داوا نەکردووە، جگە لەوەی، دەڵێ: مەیەڵە، « برایم ئەحمـەد » و ئەوان، بگەڕێنەوە بۆ « عێراق ». یا، بچنە دەرەوە و پڕووپاگـەندەی خـراپ بکەن، هەمـوو داواکـارییـەکـەی ئەوەبوو. کـەچیی، هێـشـتـا ئێـوە، هیـچـتـان بە دەس نییـە، ئەمـەم لێ داوادەکـەن. لەبەرئەوە، یارمەتیی ئێمەی نەدا، هیـچی لێ قەبووڵ نەکردین و ڕەتیکردەوە. جا، گەر ئێستە، ئەمە دەکا، با بیکا. ووتی: ماڵت کاولبێ، کێ دەوێرێ، ئەو قسـەیەی پێ بڵێ. ووتم: باشـە، با، « شا » ببێ بە « شـاهەنشا ». ووتـــــــــی: ئەی « شاهەنشا » نییە، چییە؟ ووتم: « شاهەنشا » نییە، تەنیا « شا »یە. چونکە، « شاهەنشا » ئەوەیە، « شا »ی « شاهان » بێ. دەبا، « شا » بە دەسـی خۆی، لە « بلوجستان »، لە « ئازربایجان »، لە « خـــۆزستان »، لە « کوردستان »، « شـا » دابنێ. تەنانەت، خۆشی دیاریانبکا، نەختێ، مافی ئەو گـەلانەش بدا، کاروباری نێوخۆ، بە خۆیان بسپێرێ، هەر بە پەنجە، خەڵک خۆی دەژێنێ. ووتم: لەبـەرئەوە، بە لای منەوە، ئەو کـوردەی، لایەنگیـریی ئێـوە دەکـا، بەو شـێـوەیەی ئێوە دەتانەوێ، ناپاکە. ئێـمـە، ڕێک دەڕۆینەوە، چیـمـان داوا لێ بکەن، ئەوە دەکەین. چونکە، ئەوەی درابوو، گەر ژیرانە، بەکاربێنرایە، دوژمن کاری تێ نەکردایە، کەڵکی لێ وەردەگیرا!
با، نموونەیەکت بۆ بێنمـەوە، چۆن دوژمن، کـاری خـۆی کرد. لە پاش مـردن، ڕەحمەت باشە. دوکتۆر « کامەران بەدرخان »، ئەو پیاوەی، بە منی ووت: بچۆ بۆ « ئەمێـریکا » و هەمـوو نامـە و شـتـەکانی دامێ. ئەو پیاوە، بۆ پیرۆزبایی پەیماننـامـــەی « 11/مـارس »، لە « بەغدا » مـیوانبوو. لە سـەر حـسـابی حوکوومـەت، لە ئوتێلێ دابەزیبوو. ویستی، لە « بەغدا »وە، بچێ بۆ لای « مەلا مـسـتـەفـا ». ناردیان بۆ « کوردسـتـان ». لەوێ، لەگەڵ « مـەلا مـسـتـەفـا »دا پێکەوە، لە « قەسری سـەلام » دانیشتن. هەتا « مەلا مستەفا »، داواکارییەکی زۆر جوان و ژیرانەی، لێ کردبوو، کە « قـەسری سـەلام » بکرێ بە « زانکۆ » و

ئەو لەوێ، زمانی کوردیی بلێتەوە و سەرۆکی « زانکۆ »ش بێ. ئەم پیاوە، داوایکرد، بگەڕێتەوە. لە کوێوە گەڕابێتەوە، باشە؟ لە ڕێی « ئێران »ەوە. ئەمە، ئەوە دەگەیەنێ، لە سەرەتاوە، ئەوانەی پێوەندییان هەبووە، بەرژەوەندیی خۆیان، لە بەرژەوەندیی گەل، لا مەبەستربووە. هەوڵی ئەوەیان داوە، بۆ حوکوومەتی « عێراق »ی بسەلمێنن، کە کورد لەگەڵیان ڕاست ناکا، لەگەڵیان ساغ نییە. لە لایەکی دیکەشەوە، هەوڵیانداوە، من ڕاکێشن. لەبەرئەوە، ئەو گێرەشێوێنانە هەبوون، جا، ئەمە نموونەیەکە، ڕەمبێ، کاری زۆر کەمی کرد بێ. بەڵام، کاری خۆی هەر کردووە.

– بەڵێ. بەڵام، ئایا ئێوە ڕاتان، بەرانبەر ڕێککەوتننامەکەی نێوان « بەعس و بارزانیی »، لەساڵی « 1970 »دا، باشبوو؟

بەڵێ. ئێمە ڕامان زۆر باشبوو. ئێمە، ناوی خۆمان گۆڕیی، ناوی تازەمان، بۆ خۆمان دانا. دوایی، خۆمان هەڵوەشاندەوە. ئامادەبووین، « مەلا مستەفا » چی دەڵێ، بە سەرکردایەتیی ئەو بیکەین. هەر چۆنێ بێ، قبووڵمانکەنەوە، وەک ئەوەی، ئەندام بین لە « پارتیی »دا، یا، وەک ڕێکخراوێکی نوێ، پێکەوە لە بەرەیەکی « کوردستانیی »دا، بە سەرکردایەتیی « بارزانیی » خەباتبکەین، هەر ڕازییبووین.

– بەڵام، هیچ هەڵسەنگاندنێکتان، بۆ ڕێککەوتننامەکەی « 11/مارس » نەبوو، وەک نووسەر، وەک ڕامیار، دەستنیشانی کەموکوڕییەکانێتان نەکرد!

هیچ پێویستی بەوە نەدەکرد، کەموکوڕییەکانی پەیماننامەی « 11/مارس »، دەستنیشانکرێ. ڕێککەوتننامەی « 11/مارس »، « سەددام حوسێن » کەموکوڕیی تێدا نەهێشتبۆوە. « مەلا مستەفا »، بە خۆمی وتووە و بە زۆر کەسی دیکەشی وتووە. دەیووت: سەرمسوڕماوە، ئەم پیاوە، هەرچی لێ داوا دەکەی، زیاتر دەداتێ. تەنانەت، من شتێکیشم بیست، بەڵام، بڕوام نەکرد، تا، جارێکی دیکەش بیستمەوە، کە ڕێککەوتننامەی « مارس »، لە چەند لاپەڕەیەکدا نووسراوە. گوایە: دوا لاپەڕەی، هەمووی لە چەند دێڕێ پێک هاتووە، ئەوی دیکەی، بە سپێتیی ماوەتەوە و « سەددام »، لە دامێنی خوارەوەی لاپەڕەکە، ئیمزایکردووە. « سەددام »، بە « مەلا مستەفا »ی وتووە: ئەمەم، بۆیە بە سپێتیی بەجێهێشتووە، تا، هەرچی کەموکوڕییەک، لە پەیماننامەکەدا دەبینن، چ جۆرە دڵخوازییەکی دیکەتان هەیە، بینووسن، من ڕازییم. جا، ئەمە زۆڵێتیی ئەو کابرایە بوو، بۆیە، لەگەڵ کورد و دەوڵەتانیشدا،

بەو شێوەیە، کاریکردووە، ئێستەش پێی دەڵێن، خڵەفاوە و شێتبووە! ئێنجا، ئەمە لەبەرئەوە نەبێ، لێرەدا، تانە لە ڕێککەوتنەکە بدەم، بڵێم: ناتەواوە. ئەگینا، ناتەواوییەکانی، شانی خۆمانی دەگرتەوە. منیش، لەبەردەسی « مەلا مستەفا »دا دانیشتبووم، نەمدەوێرا، دەمبکەمەوە. چۆن دەوێریی، پێی بڵێی: ڕێککەوتننامەکەتان ناتەواوە!

ـ ببورە. من مەبەسم لە هەڵسەنگاندنی ڕێککەوتننامەکەیە. لەو سەردەمەدا، تاکە ڕێکخراوێکی کوردیی، کە پەنجەی بۆ کەموکورییەکانی، ئەو پەیماننامەیە ڕاکیشابێ، « کاژیک » بوو. لەگەڵ ئەوەشدا، پشگیریی ڕێککەوتنەکەی، نێوان « بەعس و بارزانیی »یان کردبوو، دوو بڵاوکراوەشیان، لە سەر ڕێککەوتننامەکە، لە ماوەی دوو مانگی « مارس و ئەپریل »دا دەرکرد. ئایا، ئێوە لەو بارەیەوە، هیچتان هەبوو؟

من، هەرگیز هەڵوێستی « کاژیک »م بە دڵ نەبووە. گەر « کاژیک »، ڕێکخراوێکی ڕاستەقینە بووایە، هەر کە لە سەرەتاوە، ڕۆژنامەکەیانم بۆ دەهات، تێیدا دەبووم بە ئەندام، تەنیا بە ئەندام، بە هیچ شتێکی دیکە نەدەبووم. چونکە، پرۆگرامەکەیان « کوردستانیی » بوو. بەڵام، لە دووبەرەکییەکەی « 1964 »دا، پشتی « مەلا مستەفا »یان گرت، بڵاوکراوەیان بۆ پشگیریی، ڕێککەوتنەکەی نێوان « بارزانیی و عەبدولسەلام عارف » هەیە. واتا: هەڵوێستێکی ڕاست و ڕەوانیان نەبووە،

ـ مەبەستت ئەوەیە، لە ناکۆکییەکەی « 1964 »دا، دژی باڵەکەی پەلیتبیرۆ، پشگیریی « بارزانیی »یان کرد؟

بەڵێ. پشگیریی « بارزانیی »یان کرد. ئەو بڵاوکراوەیەشیان دەرکرد، کە نە پشگیریی دەهێنا و نە هیچ. قەیناکە، خەڵک پشگیریی ڕێککەوتننامەکەی « مارس » بکا و ڕەخنەشی لێ بگرێ، هەر دووکی ئەو کارە دێنێ.

پ14 : ڕاتان بەرانبەر « بارزانیی » چییە؟ چۆن کەسایەتیی « بارزانیی »، بە کورد دەناسێنن؟ « بارزانیی » وەک، قارەمانی ساڵەکانی «1931، 1943، 1946 »ی سەردەمی کۆماری « مهاباد ». « بارزانیی » وەک، سەرۆک هۆزی « بارزان ». « بارزانیی » وەک، سەرۆکی « پارتیی ». « بارزانیی » وەک، ڕابەری شۆڕشی «11/سێپتێمبەری/1961 ». « بارزانیی » وەک، سەرکردەیەکی میللیی گەلی کورد، چۆن لەو ڕابردووەی دەڕوانن؟

و14 : هەموو کەسێ، لەم جیهانەدا دەگۆڕێ، دەشتوانرێ، بگۆڕێ و بگۆڕدرێ، نەک، هەرگیز هەر نەگۆڕێ. بۆ نموونە: « عەبدولکەریم قاسم »، من لە ڕۆژێ « 27/ئۆکتۆبەری/1958 »دا، نوێنەری ئەو خۆپیشاندانە کوردییە بووم، کە هەر لە « زاخۆ »وە، تا دەگاتە، « خانەقین »ی گرتبۆوە. نوێنەر، لە هەموو « کوردستان »ەوە هاتبوون، من، بە ناوی ئەوانەوە، چوومە ژوورەوە، قسەبکەم. « عەبدولکەریم » هات، قسەیکرد، وەڵامی قسەکانی منی دایەوە. لە چوار دێڕ زیاتر نەبوو. « سدیق شەنشل » پێی ووتم: من، ئەو چوار دێڕەشم بۆ نووسیووە، هەمان قسەی منیشی، دووبارەکردەوە و ووتی: « بژی کۆماری عەرەب و کورد ».
پاشان، ئەم « عەبدولکەریم قاسم »ە وای لێهات، کە دەمیدەکردەوە، دوو کازێری دەویست، تا، بێ دەنگکرێ. ئێمە و « کۆمۆنیست »ەکان، ئەوەندە چەپڵەمان بۆ لێدا، ئەوەندەمان پێداهەڵدا، ئەوان، بە شان و بازوویاندا هەڵدەدا، ئێمە، بە چاو و برۆیدا هەڵماندەدا. کردمان بە فریشتە، بە ئەندازەیە ئەو « سدیق شەنشل »ە، لە دانیشتنێکدا، بە « کۆمۆنیست »ەکانی ووت: تکاتان لێ دەکەم، ئەم هەموو ستاییشەی مەکەن، ئەم هەموو هاوارهاوارە مەکەن و بەس بڵێن: « آعدم، آعدم ». وەڵلایی، ئەم پیاوەتان وا لێکردووە، ڕۆژێ بەسەریابێ، هەموومان هەڵدەواسێ. « عەبدولکەریم قاسم »یان کرد بە خوا. « مەلا مستەفا » خۆی لێ تێکچووبوو.
ـ مەبەستت ئەوەیە، « مەلا مستەفا »، خۆی لێ گۆڕابوو؟
بەڵێ. گەر وەک سەرکردەیەکی خێڵەکەی خۆی، وەک پیاوێکی ڕامیاریی سەیریکەین، لە گەلێ گەلێ، لەو کەسانەی من دیومن و ناسیومن، زیرەکتر و ژیرتربوو. بەڵام، لەگەڵ باری زەمانەدا نەدەسوڕا. لەگەڵ سەردەمەکەدا نەدەگونجا. مرۆڤ ناتوانێ، مێشکبشواتەوە. بە لای منەوە، مێشکشتنەوە، هەر ناشێ. مێشک شتێ نییە، بشۆرێتەوە. بێبڕواترین کەس، باسی خوا دەکا، ناوی خوا دێنێ، کە لێی قەواما، هاوار بۆ خوا دەکا. بە لای منەوە، ئەوە ناگۆڕێ، کارتێکردنی پێشکەوتن و شارستانیی ناتوانێ، جێی هەمووی بگرێتەوە.
« مەلا مستەفا »، سەرۆکێکی کورد بوو. بەڵام، ئەو کەسایەتییەی بۆی دروسکرا، لە ڕاستییدا ئەوە نەبوو. ئەو کەسایەتییە نەبوو، « نووریی سەعید » بە « سەلاح سالم » بڵێ: بە « جەمال عەبدولناسر » ڕابگەیەنە، ئێمە، چارمان

نییە، دەبێ، لە نێو پەیمانی « بەغدا »دا بین، ئیمزایکەین، چونکە، « ژەنەراڵ بارزانیی »، بە دوورایی دووسەد کیلۆمەتر. لە سنوورەکانمانەوە، بە دوازدە تیپ سەربازەوە وەستاوە. شەش تیپی، لە کوردەکانی « عێراق » و شەش تیپەکەی دیکەشی، لە کوردەکانی « ڕووسیا » پێکهاتوون. هەر ساتێ، پەلاماریدا، پەلاماردەدا. لەو کاتەشدا، خوا دەیزانێ، « مەلا مستەفا »، لە « کازاخستان »، یا لە « تورکمێنستان »، شاگرد گۆشتفرۆشبووە، یا، چی دیکە بووە. لەو کاتانەدا، لە گۆڤاری « Time »ی « ئەمێریکا »یدا، لە بەرگەکەیدا، لە ناو چەکوش و داسێکدا، وێنەیەکی « مەلا مستەفا »یان بڵاو کردۆتەوە، لە ژێریدا نووسیبوویان: « The Red Mulla ـ مەلای سوور ». ئەو کاتەی، ئەو قوڕبەسەرە، سواڵیشی دەس نەدەکەوت، ناوی، لە سەر عەرزا نەبوو، لە « ڕووسیا »دا، کورد ناوی نەبوو، ئا لەو کاتانەدا، ئەم پیاوە وای لێکرا.

ـ مەبەستت ئەوەیە، « پارتیی »، « مەلا مستەفا »ی دروسکرد؟

نەء. « پارتیی » نا. بە پێچەوانەوە دەڵێم: « پارتیی »، « مەلا مستەفا »ی دروس نەکرد. زۆر کەس، ئێمە تاوانباردەکەن، دەڵێن: ئێوە دروستانکرد. دەنگی ئێمە، لە دروسکردنیدا، نێوخۆیی بوو. نێوخۆیییەکی زۆر دیاریکراویشبوو. من، لەگەڵ ئەو « عەلی حەمدیی »یە قوڕبەسەرەی ئەو کوشتی، ناکۆکییەکەم ئەوەبوو، هەموو جارێ، لە کۆتایی بڵاوکراوەکانماندا دەمنووسی، ئیتر بۆ پێشەوە، بە سەرکردایەتی سەرۆکی ڕزگاریخوازی کوردستان، « ژەنەراڵ بارزانیی »، من، ئەوەم دەکوژاندەوە. دەیووت: بۆ؟ دەمووت: لەوانەیە حوکوومەتی « ڕووس »، پێی ناخۆشبێ. ئەم پیاوە، ئەو پیاوە نەبوو، کە ئاوا دابنرێ. ئینجا، هێندێ جار، کە خەڵکەکە هەڵیاندەدا، لێی تێکدەچوو. ئەگینا، فەقیرە خۆی کە هاتەوە، چەپڵەیان بۆ لێدەدا، زۆری هاوارکرد و دەیووت: چەپڵە بۆ من لێ مەدەن، « عەبولکەریم » پێی ناخۆشە. بەڵام، هەموو لایەک، کە سەردانیاندەکرد، وایان حسابدەکرد، کە ئەو هەموو شتێکە. ئێدی، ئەوە وای لێ کرد، لە خۆی بگۆڕێ. واتە: گەر لە خۆی نەگۆڕایە، بە شێوەیەکی دیکە بجولایەتەوە، زۆر شت دەگۆڕا. بۆ نموونە: ئەوەی بە منی دەووت، خۆی جێبەجێی نەدەکرد. لە سەرەتادا، بە منی ووت: ئێوە، شەڕ لەگەڵ حوکوومەت مەکەن، منیش شەڕ ناکەم. کەچیی، خۆی شەڕیکرد. نامەی بۆ « مام جەلال » دەنووسی، وا مەکەن و وا بکەن. لە هەمان کاتیشدا، نامەی بۆ یەکێکی

دیکەش دەنووسی، شتێکی دیکەی ڕادەسپاردن. لەگەڵ ئێمە ڕێکدەکەوێ، کۆنگرێس بگرین، ئەندامانی کۆنگرە. چییان بڕیاردا، با بیدەن، لە « پارتیی» دەرماندەکەن، ئەو دەهێڵنەوە، کێ دەردەکەن، دەریکەن و ببڕێتەوە. کەچیی، لە بنەوە، نامەی بۆ دۆستەکانی خۆی دەنووسی، دەیگووت: ئێمە، کۆنگرێسی خۆمان دەگرین و ئەوان دەردەکەین. ئیشەکانی زۆر سەیربوو. تەنانەت، کەسی دلسۆزی خۆی هەبوو، پیاوێکی وەک « میر حاج ئەحمەد »، کەم کەسم دیووە، وەک ئەو پیاوە دلسۆزبێ. « میر حاج » ڕازیی نەبوو، « مەلا مستەفا » بیکا بە ئەندامی پەلیتبیرۆی « پارتیی »، ووتی: نایکەم، بۆ؟

ـ لەبەرئەوە دەیزانی، « بارزانیی »، بڕوای بە پارتایەتیی نییە؟

بەڵێ. بڕوای بە پارتایەتیی نەبوو. لە پاشان، ئەو ڕێیەی « مەلا مستەفا » دەیگرت، ئەو لەگەڵی نەبوو. دەیزانی، « مەلا مستەفا » دەیەوێ، لایەنی « ئەمێریکا » بگرێ. ئەویش، ئەو بیروڕایەی ئەوی بە دڵ نەبوو.

ـ باشە مامۆستا، وەک « میر حاج »، بەوە ڕازیی نەبوو، ئەدی، ئێوە بۆچی پەسەندتانکرد؟

ئێمە کێین؟

ـ هەموو ئەو ئەندامانەی پەلیتبیرۆ، کە لەگەڵ « بارزانیی » مانەوە و بڕیاری کارکردنتان دا.

بۆ کێ لە پەلیتبیرۆی « پارتیی »دا هەبوو، بوێرێ، « مەلا مستەفا » قەبووڵ نەکا؟ بە سەدان کەسی خوێنەوار، هەر لە « سولەیمانیی »دا هەبوون، دەیانگووت: گەر « مەلا مستەفا » لە « ڕووسیا » بێتەوە، ئێمە، هەموو دەبین بە « پارتیی ». من ناڵێم، هەڵیکوتایە سەر بارەگای « پارتیی » لە « بەغدا » و ئەندامانی پەلیتبیرۆی بە شەق کردەدەرەوە. ئەو پەلیبیرۆیەی، خۆی داینابوو! نەک ئێمە هەڵمانبژاردبێ، بە زەبری تفەنگ، هەموویانی دەرکردەدەرەوە. تەنانەت، نەیانوێرا، دژی « مەلا مستەفا »، نارەزاییدەربڕن. لە نێو ئێمەشدا، کەس نەیدەتوانی، بەربەرەکانی « مەلا مستەفا » بکا. هەموو ناکۆکییەکەشی لەگەڵ من، کە منی بە گوناهبار دەزانی، هەر لە سەر ئەوەبوو. لە « 1964 »دا ئەوانەی لەگەڵ ئێمە هاتن، دژی گفتوگۆکەی « بارزانیی و عەبدولسەلام » بڵاوکراوەکەیاندەرکرد، ئەوانە خۆیان، زۆربەیان لەگەڵ « مەلا مستەفا »دا، لە ئیشەکەدا بوون. بۆیە، « مەلا مستەفا » پرسیاری لێ دەکردن و دەیووت: بۆچی ئێوە، ئەوسا لەگەڵمدا بوون و ئێستەش لەگەڵم نین؟ بۆچی ڕاتان

گـــۆڕیوه؟ بۆیه، « مه‌لا مسته‌فا » ده‌یووت: دیاره، خه‌تای « برایم ئه‌حمه‌د ».
من پێم ده‌ووت: وه‌ڵلایی، « مه‌لا مسـته‌فـا »، من ده‌زانم، ئه‌م تاقمـه‌ی ده‌ور و پشـتت، وات لێ ده‌که‌ن. به‌ڵام، ئه‌م تاقمـه، خـۆت هه‌ڵبـژاردوون. تۆ هێـشـتـا نه‌گه‌یشـتویته، ئه‌و پله‌یه‌ی خـه‌ڵک هه‌ڵبژێری. تۆ ڕه‌نگه وا بزانی، من نازانم، مه‌راییت بۆ بکه‌م. من پارێزه‌ربووم، پیاوکوژم ڕزگارکردووه. بێ گومان ده‌بێ، به درۆ پینه‌وپه‌ڕۆیکه‌ی، وا نییـه؟ پارێزه‌رێ، پیـاوکـوژ ڕزگـارکـا، هه‌ر ده‌بێ، درۆی بۆ هه‌ڵبه‌ستێ. وا نییه؟ ده‌بێ، به‌هانه بۆ ڕزگاربوونی بدۆزێته‌وه. ووتم: ده‌متوانی، له‌وان زیاتر و زۆر جوانتریش، قسـه‌ی قه‌به‌قه‌به بکه‌م و مـه‌رایی و ڕیایی بکه‌م. به‌ڵام، من بۆ هه‌ر دووکـمـان، به شـه‌رمی ده‌زانم. دوا جـار، ئه‌م قسـانه‌م هه‌مـووی، سـاڵی « 1970 » پێ ووتووه. به براده‌رانی په‌لیتـبیـرۆی ووتبوو: « برایم ئه‌حـمـه‌د » له « ئه‌ورووپا » بێ، من له‌گه‌ڵ ئێوه‌دا ڕێک ناکه‌وم، ده‌بێ، بێته‌وه. چونکه، له‌وێ خه‌ریکی کارکردنه. ئه‌و وای ده‌زانی، من هه‌مـوو شـتـێکم، من به زۆریی ئه‌و هاتمه‌وه، هێـشـتـا به ته‌واویی، چارهسـه‌ری نه‌خۆشـییـه‌که‌م نه‌کـردبوو. ئه‌وه‌بوو، له ترسی ئه‌وه‌ی نـه‌وه‌ک « ئێران »، ئه‌و هه‌واڵه بڵاوکه‌نه‌وه. گوایه: خه‌ریکن، له‌گه‌ڵ مندا ڕێکده‌که‌ون، یه‌کسه‌ر ڕامکرد بۆ لای « مـه‌لا مسـتـه‌فـا » و هه‌مـوویم بۆ گێـڕایه‌وه. له دانیـشـتنێکدا، کـه ئه‌نداماني په‌لیتبیـرۆی خۆی، وایان نیشـاندا، گوایه: ئه‌وان به‌و جۆره ڕازیی نین، له‌گه‌ڵ ئه‌و کۆمه‌ڵه‌دا ڕێککه‌ونه‌وه، ڕووی ده‌می تێکردن و ووتی: ئێوه چۆن ڕازیی نابن؟ پاره‌م دانێ، له‌نێویانبه‌رن، چه‌کم دانێ، بیانکوژن. به‌ڵام، هیچتان پێ نه‌کرا. ئه‌وه‌ته، ماوه‌ته‌وه سه‌ر ئه‌و لایه‌ی، بڕیاری به ده‌سه، داوایان له من کردووه، له‌گه‌ڵیاندا ڕێککه‌وم.
« مه‌لا مسـته‌فا » لای وابوو، « تۆفیق وه‌هبیی »، پیاوی « ئینگلیز »ه. چونکه، له « له‌نده‌ن »ـه‌وه، نامـه‌ی بۆ نووسیبوو. هه‌روه‌ها. حـوکوومه‌تی « ئێران »یش، له‌و لاوه پێـیـان ووتبـوو، بۆ خۆتان ڕێککه‌ون، وایان زانیـبوو، گه‌ر ڕێککه‌وتن بێ، « مـه‌لا مسـتـه‌فـا »، ئه‌و ده‌سـه‌ڵاته‌ی نامـێنێ. ئه‌و ڕێککه‌وتنه‌ی، نێـوان حـوکـوومـه‌ت و شـۆڕش تێکده‌چێـتـه‌وه. خـۆ ناشێ، نیـازیان پاراسـتنی به‌رژه‌وه‌ندیی ئێمه بووبێ! له‌به‌رئه‌وه، « مه‌لا مسته‌فا » وای زانیبوو، من پیاوی ئه‌و دوو لایه‌م. ئینجا، که پێی ووتم: ده‌بێ، پێکه‌وه دانیشین، من ئه‌و قسانه‌م، هه‌مـوو پێ ووت. ووتم: من ده‌مـتـوانی، ئه‌م درۆیانـه، هه‌مـووی بۆ تۆ بکه‌م. من ئه‌م قسانه‌م، به « پاکره‌وان » ووتووه، کاتێ، که تۆ من نارد، « شا » ببینم، تا،

بۆی بسەلمێنم، کە « کۆمۆنیست » نیم. دۆسییەیەکی گەورەی، لە سەر چالاکیی کوردی « عێراق »، لە بەردەمدابوو. « پاکرەوان » پێی ووتم: گەر چووین و « شا »مان بینی و لەگەڵی دانیشتین، لێی پرسیت، ئەم ووتارانەی، لە « خەبات »دا، دژی حوکوومەتی « ئێران و شا » بە تایبەتیی نووسراون، لە وەڵامدا دەڵێی، کێ نووسیویێتی؟ ووتم: دەڵێم: من نووسیومە. ووتی: کەواتە هیچ، ئیشکەمان سەر ناگرێ. ووتم: سەردەگرێ. ووتی: چۆن؟ ووتم: من نازانم، چۆن. بەڵام، سەرگوزشتەیەک لای خۆتان هەیە، دەگێڕنەوە، دەڵێن: گوایە لە کاتی خۆیدا، بۆ وەزیر هەڵبژاردن، دەبووایە، یەکێکیان هەڵبژاردایە، وەڵامی سەدویەک پرسیاریبدایەتەوە، هەمووی ڕاستبووایە، ئێنجا، دەیانکرد بە وەزیر. یەکێ هەڵبژێرراوە، سەد پرسیاری وەڵامداوەتەوە. پرسیاری سەد و یەکەم دەبووایە، « شا » خۆی لێی بکردایە. « شا » پێی ووتووە: حەزدەکەم، تۆ ببی بە وەزیر. چونکە، تۆ پیاوێکی زیرەکی. بەڵام، پرسیارەکەی من ئەمەیە، مرۆڤ چۆن بەختیار دەبێ؟ ئەویش دەڵێ: پارچەیە کاغەزم بدەرێ، تا، لە سەری بنووسم. « شا » دەڵێ: پێویست ناکا، بە دەمیی بیڵێ، بۆچی لە سەر کاغەز دەینووسی؟ پیاوەکە دەڵێ: نا، یارمەتیمبدە، دەبێ، بینووسم. پارچەیە کاغەزی دەدەنێ، شتێکی لە سەر دەنووسێ، دەیخاتە گیرفانی. پاشان، دەڵێ: قوربان! مرۆڤ بەوە بەختیاردەبێ، هەموو ژیانی، بە سەربەرزیی و خۆشیی ڕابوێرێ، کە مردیش، کوڕێکی هەبێ، بتوانێ، جێ و ڕێی باوکی بگرێتەوە.
« شا » دەڵێ: داخم ناچێ، سەر نەکەوتی. دەڵێ: بۆ قوربان؟ دەڵێ: چونکە، مرۆڤ ئەو کاتە، بەختیارترین کەس دەبوو، کە مردن نەبووایە. دەڵێ: قوربان! خۆ من لە کاغەزەکەدا، وام نووسیوە. « شا » سەیری کاغەزەکە دەکا، ڕاستە، وای نووسیوە. لێی دەپرسێ: ئەدی بۆچی، وات نەووت؟ دەڵێ: قوربان! لەبەر خاتری تۆ، گەر مردن نەبووایە، سەرەی« شاهەنشایی » نەدەگەیشتە سەر تۆ. منیش ووتم: لە بەر خاتری ئێوە، لە بەر خاتری ئەم دانیشتنەمان، نامەوێ، بە « شا » بڵێم: من ئەمەم نووسیوە، نامەوێ، درۆزنبم. ناشمەوێ، لەگەڵ مرۆڤێکی درۆزندا، سەوداکارییبکەم، گەر وەک کورد، هەڵسوکەوتمان لەگەڵ دەکەن، وەک گەلێکی دۆست، وەک برایەک، یارمەتییماندەدەن، تا، بە مافی خۆمان بگەین، ئەوا باشە. ئێمە، ئەو کاتە جنێوماندااوە، چونکە، ئێوە لای ئێمە، لایەق بە جنێویوون، کوردتان کوشتووە، کوردتان لە سێدارەداوە. ئێستا یارمەتیی کورد دەدەن، لایەقی پێدا هەڵدانن. لەبەرئەوە، نە بۆ خۆم و نە بۆ

ئێوەش، بە ڕەوای نابینم، لەگەڵ ساختەچییدا، پێوەندیی و هەڵسوکەوت بکەم.
دەسیکردە ملم و ووتی: ئێستە، تۆ لای من، لە جاران خۆشەویستری. ووتم:
« مەلا مستەفا »، ئەمەم بە « پاکڕەوان » ووتووە، بە تۆش، هەر وا دەڵێم. من،
گەر بمویستایە، درۆت لەگەڵ بکەم، دەمتوانی، درۆبکەم. بۆچی، تۆ وا دەزانی،
هەموو کەسێ، وەک یەک وایە؟ « مەلا مستەفا »، وای دەزانی، من
بەربەرەکانیی ئەو دەکەم، دەمەوێ، جێی پێ لێژکەم. ووتم: وەڵڵایی، بە
گەرەکێکی « سولەیمانیی »دا بڕۆم، تەنانەت، گەر گەڕەکی خۆشمان بێ،
بیست کەس نامناسێتەوە. چونکە، من نیوەی ژیانی خۆم، لە ژێرزەمیندا
بەسەربردووە. یا، لە دەرەوەی شار بووم. من، زۆر لە « سولەیمانیی » نەبووم،
هەمووی پێکەوە، بیخەیتە سەر یەک، بسیازدە چواردە ساڵ زیاتر، لە
« سولەیمانیی » نەبووم. تا، پانزدە ساڵیی، لە « سولەیمانیی » ژیاوم، ئەویش،
منداڵبووم. منداڵ چۆن دەناسرێ؟ کەس نایناسێ، ڕەنگە، خەڵک بە ناو
بمناسن. بەلام، بە بینین، سەر و چاوم ناناسنەوە. تۆ پیاوێکی، لە هەموو
جیهاندا ناوت هەیە. لە هەر کوێ بتبینن، دەتناسنەوە. من چۆن دەتوانم، جێی
تۆ بگرمەوە؟ بۆ نموونە: یەکێکی وەک « شا » پێی دەڵێ: وا بکە. یا، فلانە
کەس « کۆمۆنیست »ە، گوێی لێ دەگرێ. لەوانەیە، یەکێکی دیکەش، شتێکی
دیکەی پێ بڵێ، بە قسەی ئەویش بکا. تۆ پەرتووکەکەی کابرات خوێندۆتەوە؟
ئەوەی پێشتر، ناوتبرد.
ـ « دانا ئادەم شمیدت »، ناوی پەرتووکەکەشی، « گەشتێ بە نێو پیاوە
ئازاکاندا »یە.
« ئادەم شمیدت »، پێی دەڵێ چی؟ هەر وای پێ دەڵێ: کاتێ « مەلا مستەفا »،
باسی ئەوەی بۆ دەکا، « عەبدولکەریم »، بە زۆر هێناویتییە « پارتیی »یەوە،
دەڵێ: من « پارتیی » نیم و « پارتیی »شم ناوێ. ئەویش، پێی دەڵێ: کەواتە:
تۆ هەموو ئێشەکە، بۆ « برایم ئەحمەد » و ئەوان بەجێدێڵی. خۆشت، وەک لە
دێیەک لێی دانیشتبی و « ئاغا » دێ بی؟!!
ـ مامۆستا! وەک دۆستایەتیی و برادەرایەتیی، بەڕێزتان، تا چەند، لە
« بارزانیی »یەوە نزیکبوون؟
من، یەکەم جار، « مەلا مستەفا »م لە « سولەیمانیی » ناسیوە. ئەوەندەی، لە
دەسمهاتبێ، زۆر یارمەتیمداوە.
ـ ساڵی چەند؟

ئەو سـالانەی، ئەو بـۆ « سـولەیمانیی » دوورخـرابۆوە، پێش سـاڵی « 1940 » بوو. بەڵام، ئێمە نەماندەتوانی، یەکدی ببینین. لەبەرئەوە، لای دەرمانخانـەی « ئەسکەندەری ئەجزاچیی »، یەکدیمان دەبینیّ. چونکە، دەرمانخانە جێیەکە، هەموو کەس، مافی ئەوەی هەیە، بچیّ. لە دواییدا، ئەو « ئەسکەندەر »ە، یەکیّ لەو کەسانە بوو، لە گفتوگۆکەی « 1964 »دا کاریدەکرد. من ناسیاوییەکی ئەوتۆم، لەگەڵ « مەلا مستەفا »دا نەبوو. بەڵام، یارمەتیماندەدان. ئەوان، لە کـاتێکدا، لـە « ئێـران » بوون، لە برسـادەمـردن، نەخـۆشـبـوون. من وەک سکرتێری لقی « ژ. ک. » لە کوردستاندا، بە خێریّ، پارەمان بۆ کۆدەکردنەوە. سیّ جار، پارەمان بۆ کۆکردنەوە. چونکە، لە سەرەتادا، « قازیی مـحەمەد »، یارمـەتیی نەدەدان، وەک سیـخوڕی « ئینگلیـز »، سـەیریدەکردن. هێشتـا، ڕێککەوتن لە نێوانیاندا نەبوو، لە گوندێکی « ئێران » دایاننابوون، تووشـــی « تیفۆس » بووبوون، زۆریان لیّ مردن.

پ15 : بەڕێزتان دەزانن، ئەورۆ، شـەڕێکی زۆر « سـەخت، بیّ بەزەییـانە و ماڵوێرانکەرانە »، لە کوردستاندا، لە « 1994/05/01 »ەوە، لە نێوان « پارتیی و یەکێتیی »دا دەسـپێکردووە و تا ئێسـتەش، هەر بەردەوامە. ئایا، لەو بڕوایەدا نین، ئەو شـەڕەی ئەورۆ، لە کوردستـاندا هەیە، هەر بەردەوامیی، ئەو شەڕە چەپەڵە بیّ، کە لە نێوان « بارزانیی » و باڵەکەی پەلیتبیرۆدا، لە ساڵی «1964 »دا دەسپێکرد؟

و15 : دیارە نـاتوانی، بە هەمـان بەردەوامـیی بزانی: نە سـەردەمەکـە، ئەو سـەردەمەیە، نە خـەڵکەکە، ئەو خـەڵکەیە. جیـهـاش ئەو جیـهانە نییـە. هەمـوو شتیّ گۆڕاوە. بەڵام، لە فاکتەرە سـەرەکییـەکانی، ئەو شـەڕە کۆنەی تێداماوە، دەسـی بیانیی، خوپەرستیی و دەسکەوتپەرستیی خۆمان.

ــ لەو بڕوایەدا نین، ئەم شـەڕە لە کوردستـاندا، لە نێوان « مەسـعوود بارزانیی و جەلال تاڵەبانیی »دا، شەڕی ڕابەرایەتیی بیّ؟

دەتوانم، بڵێم: مـوسوڵمـانەکانی « یۆگۆسـلافیا »ی کۆن، شەڕ بۆ سـەربەخۆیی و دامـەزراندنی دەوڵەت دەکەن. شـەڕ لە « سۆمـاڵ » و « سـۆدان » دەکریّ، بۆ ئەوەیە، لایەکیان دەسـەڵاتداربن. شـەڕ لە « جەزایر »، لە نێوان موسـوڵمانەکان و پارتە « عیلمـانیی »یەکانی دیکەدا، لە سـەر فەرمـانڕەوایی دەکریّ. بەڵام، من لەو بڕوایەدا نیم، لە « کوردسـتان »دا، شـەڕ لە سەر دەسـەڵات و فەرمـانڕەوایی

بێ. کوا دەسەڵاتی ڕامیاریی؟ کێ دەس بە سەر فەرمانڕەواییدا دەگرێ؟ لەوانەیە، بیانوویەکی بۆ بدۆزرێتەوە. لەبەرئەوە، هەر شەڕێ، لە کوردستاندا ڕوویدا، ئەو کەسەی دەیەوێ، درێژە بە شەڕکردن بدا، بە هەر نیازێبێ، دوور لە ڕووتان، ئەو کەسە، یا کەرە، یا ناپاکە. کەس ناتوانێ، هیچ جۆرە شتێکی دیکەی، بۆ بدۆزێتەوە.
بەڵێ، گێرەشێوێن زۆرە، دوژمن زۆرە، پیاوخراپ زۆرە، هەموو ئەمانە، دەسیان لە هەڵگیرساندنی شەڕەکەدا هەیە. بەڵام، گەورەکانیش، سەرکردەکانیش، نەک هەر سەرکردەکانی، ئەو دوو لا شەڕکەرە، هەموو سەرکردەکانی دیکەش، گەلێ گەلێ لە ناودارەکانیان، لە شەڕەکە دان و سەرکردایەتیی دەکەن. ئەو ئەرکەیان، لە سەر شانە، ڕۆڵی گرنگی خۆیان، دژی شەڕ پیشاندەن.
گەر خەڵکەکە، بە قسەیان ناکەن، چەکدارەکان، بە قسەیان ناکەن، یا، خۆیان وایان دەوێ، بۆ ئەوەی بیسەلمێنن، بە ڕاستیی، ئاشتیییان دەوێ، یا، هەر درۆدەکەن. گەر درۆدەکەن، ئەو خەڵکە. بۆ تەفرە دەدەن، بۆ خۆیان بەدناودەکەن. گەر ڕاستیشدەکەن، بۆ جێبەجێی ناکەن. گەر پێیان جێبەجێ ناکرێ، بۆ لە سەر رادیۆ و تێلێفیزیۆن و لە ڕۆژنامەکاندا، چاوپێکەوتن ناکەن، باسیکەن و بڵێن: ئێمە، ئەمەمان دەوێ، کێ لەگەڵ ئێمەیە و دژی شەڕە، بێتە لای ئێمە. کێ لەگەڵ پیاوکوژیی و کوردکوژیی و براکوژیی و شەڕکردنە، بچێتە ئەو لایە. کەم کەس، بە قەدەر من، دەردی شەڕی براکوژیی لە دڵدا ماوە. ئێدی، ئەوانەی دیکە، یا مردوون، یا ماون و تێیدا نەبوون، کە ئەو دەردە بچێژن. من تاقەتم نییە، ئەوەندە لە سەر هۆنراوە بەردەوامبم. جار و بار، هۆنراوەم دەنووسی، لە سەر ئەو شەڕە نالەبارە، هۆنراوەیەکم هەبوو، چیم ووتبوو، توخوا، گەر لە بیرممابێ، ئا:

| | |
|---|---|
| برای پێشمەرگە، زۆر چاک بیزانە | ئەو سەرکردەیەی، کەوا پێت دەڵێ |
| تفەنگ بگریتە، برای کوردی خۆت | ئەوە دوژمن و ئەوە خوێنە خوێت |
| دوژمنی کورد، هەر داگیرکەرە | گەر هیوا و بەو بێ، ڕەنجت بێ بەرە |
| هەر بە تەبایی و یەکێتی و خەبات | گەلانی دونیا، گەیونە ئاوات |
| تەباییت نەبێ، چیت لەوان کەمە | هەر ناتەباییت، سەرچاوەی خەمە |

ـ بەڵێ. بەڵام، مەبەسی پرسیارەکەی من، ئەوە نییە، ئەورۆ، لە « باشووری کوردستان »، دەوڵەتێکی سەربەخۆ نییە، ئەو گەلانەی، بەڕێزتان ناوتانبردن،

)

هەموویان، خاوەنی دەوڵەتی ناسیۆنالی تایبەتیی خۆیانن، مەبەسم ئەوەیە، شەڕەکە، لە نێوان « پارتیی و یەکێتیی »دا، لە سەر دابەشکردنی جەماوەرە، هەر دوو لایان دەیانەوێ، زۆربەی زۆری جەماوەر، بەلای خۆیاندا ڕاکێشن. شەڕەکە، لە سەر کۆنترۆڵکردنی، ناوچە جیاجیاکانی کوردستانە، لە سەر دەسەلاتی ڕامیاریی و سەربازیی و ئەو « فیدراڵیی »یەیە، کە ئەوڕۆ، لەو بستۆکە ڕزگارکراوەی « باشووری کوردستان »دا دامەزراوە. شەڕەکە، لە نێوان « جەلال تاڵەبانیی و مەسعوود بارزانیی » دایە، لە سەر ئەوەی، کامیان بە ڕابەری کورد دابنرێن، ڕای بەڕیزتان، لەو بارەیەوە چییە؟
من شتێک پێ دەڵێم: تا ماوەیە لەمەو پێش، بیروڕای منیش وابوو. بەڵام، ئێستە، من لەو بڕوایەدا نیم. بۆ؟ چونکە، دە جار زیاتر بیستوومە و خوێندومەتەوە، « جەلال تاڵەبانیی » بە « مەسعوود بارزانیی » ووتووە، دەتەوێ، سەرۆکی « پەرلەمان » بێ، فەرموو، سەرۆک بە. دەتەوێ، سەرۆکی « وەزیران » بێ، فەرموو، وەرە پێشەوە، چی تۆ هەڵیدەبژێری، چی بۆ من دیارییدەکەی، من دژ نابم و ئەوەم دەوێ. بەڵام، تەنیا جارێ، ئەمە لە دەمی « مەسعوود »ەوە دەرنەپەڕیوە. ئەمە، دەمخاتە گومانێکەوە، کە هەر دووکیان وەک یەک، بیر لەو کێشەیە ناکەنەوە.
ـ کەواتە: هۆی ئەم شەڕە چییە؟
بە بڕوای من، هۆی ئەم شەڕە، پارەیە.
ـ بە تەنیا پارە؟
دەسەلاتیشە. ئێستە، برادەرێ تێلیفۆنی بۆ کردم، ووتی: « مەسعوود » دەڵێ: وەستاندنی شەڕەکە، بە دەس من نییە. بەڵگەشی هێنایەوە، کە بە دەس ئەو نییە. ووتم: بەڵام، لێرەدا یەک شت هەیە، با بیسەلمێنێ، کە بە دەس ئەو نییە. ووتی: چۆن؟ ووتم: با بچێتە سەر تێلیڤیزیۆن و بڵێ: من ئەمەم دەوێ، کێ لەگەڵ منە، با، هەڵوێستی خۆی ڕوونکاتەوە، کێ لەگەڵ ئەو کەسانەیە، داوای شەڕدەکەن، با بچن، لەگەڵ ئەوان بن. تەنیا ئەوەندە بڵێ، بەسە. کە ئەمە ناڵێ، مانای وایە، درۆدەکا.
« مەسعوود »، بۆ « پەرلەمان »ەکە، ناگرێتە دەس خۆی؟ پێیان ووتوون: « پەرلەمان »ەکە وەرگرن و پارەکەی « برایم خەلیل » بێنن، لە حوکوومەتەکەدا خەرجیکەن، بۆ قەبووڵی ناکا، ببێ بە سەرۆکی وەزیران، ببێ بە سەرۆکی « پەرلەمان » ؟ بۆ دەبێ، هەر سەرۆکی « پارتیی » بێ؟ لەبەرئەوە، بڕوام بەوە

نییە، لە سەر ئەوەبێ. ئەمە، لە سەر خزمەتکاریی بیانییە، لە بەرژەوەندیی بیانیی زیاتریش، هیچ جۆرە بەرژەوەندییەکی دیکەی تێدا نییە و هیچ شتێکی دیکەش بۆ کورد مسۆگەر ناکا. بڵێی: ئێستە « یەکێتیی » سەردەکەوێ، بە لای منەوە، بە هیچ جۆرێ، بە سەرکەوتن دانانرێ، بەڵکوو مردنە.

پ16 : کەواتە، پێشنیازی بەڕێزتان، بۆ چارەسەرکردنی، ئەم شەڕە خۆکوژییەی نێوخۆی « کوردستان » چییە؟
و16 : پێشنیازم، بۆ چارەسەرکردنی ئەم شەڕە، ئەوەیە، حوکوومەتێکی کاتیی دروسکرێ.
ـ « کوردستانیی » یا « عێراقیی » ؟
« عێراقیی » دروستکەن، چاکترە. « حاجی قادری کۆیی » ووتوویەتی:
« بێگانە چاکە دوژمن نە دوژمنێ لە خۆمان »
گەر، بە دوژمنیشیان بزانین، هیچ نەبێ، با ئەرک و عەزێتەکە، لە سەر ئەوان بێ.
لە پاشان، شتێکی دیکە هەیە، شەڕبوەستێنرێ، هەر دوو لا، بگەڕێنەوە بۆ شوێنی پێشووی خۆیان. بە دەیان لیژنەیان، لە هەموو لایەک، بۆ شەڕ وەستاندن داناوە، ئەم لیژنانە، بخەنەکار، ئەو کەسانەی تاوانبارن و شەڕیان هەڵگیرساندووە، ئاگرەکەیانکردۆتەوە، ئەوانە سزابدرێن، بگیرێن، نەک وەک، ئیشەکەی جارانی پێشووی، ئێمەی لێ بێتەوە، پیاوکوژێ لای « مەلا مستەفا » ڕایدەکرد، ئێمە دەمانکرد بە فەرماندە و لە سەر سەرمان دادەنا، یەکێ لای ئێمەوە، بە خۆی و بیست تفەنگەوە ڕایدەکرد و پەنای، بۆ بەر « مەلا مستەفا » دەبرد، ئەوان یەکسەر، دەیانکرد بە لێپرسراوێکی گەورە. گەر، ڕاستدەکەن، گەر دڵسۆزن، گەر پاکن، پێویستە، ئەمە وازلێبێنن، گەر درۆشدەکەن، ئەوا، پێویست ناکا، باسی هیچ بکەین. بەم ڕۆژگارە، خەڵک تێلیفۆن دەکەن و دەڵێن: دەچین بۆ « کوردستان » و ناوبژییدەکەین. منیش، پێیان دەڵێم: بە دوو کەس و سێ کەس، هیچ ناکرێ، دەچن، چێ دەکەن؟ ئەو پەیمانەی، ئەوان، لە ڕێککەوتننامەکەی، ڕۆژی بیستویەکی مانگدا داویانە، ئەو قسانەی ئەوان، بە خۆیان ووتووە، بە شەڕکەرەکانیان ووتووە، کەس ناتوانێ، لەوە زیاتریان پێ بڵێ.

پ17 : ئایا، تا ئێستە، هیچ هەوڵێکتان، لەگەڵ ئەو دوو لا شـــــەڕکەرەدا « پارتیی و یەکـێـتـیی » داوە، بۆ ئەوەی، ئەو شـــەڕە بوەسـتێ، یا، ئەو ناکۆکییانەی نێوانیان بنەبڕکرێ؟
و17 : نەخـێـر. مـن وەک خـۆم. هـیـچ هـەنگاوێکم نەناوە. وەک کۆمـەڵیش، لێرە هیـچـمـان نـەکـردووە، جگە لـەو کـۆبوونـەوەیەی ئەو ڕۆژە، لـە « مـەڵبـەندی ڕۆشنبیریی کوردیی » کرا، ئەویش، خۆتی تێدا بووی. لە کۆتاییدا، بڕیار لە سەر ئەوە درا، نامـەیەکیان بۆ بنووسرێ. بەڵام، خەڵکەکە پەیتاپەیتا، تێلێفۆن دەکـەن، تا، نوێنـەر لێـرەوە، بۆ « کـوردسـتـان » بچێ و لەگـەڵیـان هـەوڵبـدەن. نازانم، مـن خـۆم، لەگـەڵ ئەوەدا نیم. چونکە، تا خـۆیان، ئارەزووی شـەڕ وەستاندنیان نەبێ، ئێمە، هیچ کارێکمان پێ ناکرێ.
ـ واتە: هیچ پێوەندییەکت، بە هیچ لایەکیانەوە نییە؟
نەوەڵڵا. لە ڕقدا، پێوەندییم نییە.

پ18 : دوای ئـەوەی، لـە بـەهـاری « 1975 » دا، شـۆڕشـی چواردەســاڵەی گەلەکەمـان، لە « باشووری کـوردسـتـان »، تووشی نووچدان و تێکشکان و هەرەس بـوو، « بارزانیی »، وازی لـە خـەباتی چەکـداریی هێنا، بەڕێزتان، لە کوردستان بوون، زۆربەی کادێرە ڕامیاریی و سەربازییە کۆنەکانی خۆتان، وەک « پارتی شـۆڕشگێرانی کوردستان » لە شـۆڕشـدا بوون، بۆچی لەو ڕۆژە ڕەشـەدا، درێژەتان بە خـەباتی خـۆتان نـەدا، تا بتـوانن، بۆ نەتەوەی کـورد و گەلانی سەر ڕووی زەویشـی بسەلمێنن، کە دید و بۆچوونەکانی ئێوە، لەگەڵ دید و بۆچوونەکانی « بارزانیی »دا، جیـاوازییـان هـەبووە. بە تایبـەتیی، لەو ڕۆژە شوومەی، گەلی کوردی پێدا تێدەپەری؟
و18 : قوربان، ئێمە پەرشـوبڵاوبووین. پێنج کـەسی چەکدارمان نەبوو. هەموو لەشکرەکە، بـەدەس خـۆیـانەوە بوو. کـادێرەکـانیـشـمـان، هـەمـوو پەرشـوبڵاو کـرابوونەوە، هـەر کـەسـە، بە لایەکـدا هـەڵدرابوو، هـەر یەکـەی، بە کـارێکی سەیرەوە، خەریککرابوو.
لەوانەی پەلیتبیرۆش، شتێکمان نەبوو، نە ڕێکخراوێکی ڕامیارییمان هەبوو، نە پەلیتـبیـرۆشـمـان هـەبوو. ئێمـەش، لەگـەڵ کۆمـەڵەکەی دەورویشتی « مەلا مستەفا »دا خەریکبووین. هـەر چیشمان بکردایە، هیچ سوودێکی نەدەبوو.
لەو کاتـەدا، « مام جەلال » لەگەڵ « قەزافیی »دا، خەریکی پێوەندییکردن بوو،

نامەیەکی بە « هێرۆ »ی کچمدا ناردبوو، ئێستەش، لام مـــاوە، وەختبوو، لە « ئێران »، « هێرۆ » بگرن. چونکە، بە قاچاغیی هاتبوو. نامەکەم بـــــرد بۆ « مەلا مستەفا » و پێم ووت: ئەم نامەیە، بۆ تۆ هاتووە. لە نامـەکەدا، نووسرا بوو: گـەر تـەنیـا، مـانگێ بمێننەوە و خـۆتـان بە دەسـەوە نەدەن، بەرگـریی لە خۆتـان و شـۆڕشـەکـە بکەن، دەتوانم، ئەوەندەی « ئێران »، بە پارە یارمـەتیی داون، ئێمە دوو ئەوەندە، یارمەتییتان بدەین.
واتە: « مام جەلال »، بەڵێنی وەرگرتبوو. ئەمـە وا. ئێ، خۆ چەکیش، بە پارە دەکڕێ، لە هـەموو بازاڕەکانـی جیـهانـدا دەتوانی، چەک بکڕی. لە یـەکـەمین جەنگی جیهاندا، « ئەڵمان و فەڕەنسە »، چەکیان لە یەکدی دەکڕی!
« 6/مارس »، کە « شا »ی « ئێران »، « سـەددام »ی ماچکرد، من لە« تاران » بووم. بە تێلێـفـیـزیۆن بینیم. بە ئـیـشـی شـۆڕش، بۆ « تاران » چووبووم. لە دواییـدا، « نەسـیـریـی » پێی ووتم: بۆیە، منیـان ناردبوو بۆ « تاران »، نەوەک بگەڕێمەوە باوەشـی حوکوومەتی « عێراق ». من و « فووئاد عارف »یان ناردبوو بۆ « ئێران ». « مەلا مسـتـەفا »ش پێـی ووتبوون: بە ڕێزەوە بمانبـەن بۆ ئەوێ. لەبەرئەوە، لەو کاتەدا، من بە ماڵ و منداڵەوە، لە « تـــــاران » بووم.
ـ واتە: دوای هەرەسەکە، هیچ نەدەکرا؟
دوای ئەوەی، گوێم لێ بوو، لە شەشی مانگدا گەڕامەوە بۆ « کوردستان ».
« شـەمسـەدین موفتیی »، بە ئۆتۆمبیلەکەی، لەگەڵ خۆی بردمییەوە. ئەگینا نەمـــدەتوانـی، بگەڕێمـــەوە. چونکە، هیچ جـۆرە، ڕێیـــە نەبوو. کــاتـێ، من دەگەڕامەوە، « مـەلا مستەفا » لە « ئێران » بوو. لەو کاتەوە، ئێمە چووبووینە « بانـە » و چادرەکــانـی خـــەڵکی دەربەدەرم دەبینـی. هەر لەوێوە، خـــەڵک بە شیـوەن و گریـان دەهاتن، تا دەگەیشتنە « حاجی هۆمـەران » و « ناوپردان ».
ئەو خـەڵکە، بە تەواویی، مـاتیی دایگرتبـوون، پرسـەیاندانابوو، هی وا هـەبوو، بۆ کـــوڕەکـەی دەگـریا، کـــە پێش پێنج ســـاڵ کـــوژرابوو. هی وا هـەبوو، بۆ مێردەکەی دەگریا، کە دە ساڵ لەوە پێشتر کوژرابوو. هێندێ کەسم بینیی، جنێویان بە ئێمـە دەدا، وایان دەزانی، کە لەو ئۆتۆمبیلەدا بووین، ئێمـەش لە ئەوانـین! ناچاربووین، دابەزین و خـــۆمـــان بشـــارینەوە. لە پاشـــان، لە ڕێگە، خـــۆپیـــشـــاندانی خـــەڵکم دەبینی. چونکە، ســـەرکـــردایەتی « پارتیی » بڵاوکراوەیەکی دەرکردبوو، تێیدا نووسیبوویان: تـەنیا دوو ڕێ هەیە، ڕێیەکی، ڕێی « بەغدا »یە، کە بچنەوە و خۆتان بە دەسەوەبدەن. ڕێیەکەی دیکەش، ڕێی

« ئێران »ە، کە بچن و داوای پەنابەریی بکەن. خەڵکەکە، هاواریاندەکرد و دەیانووت: تەنیا، دوو ڕێ نییە، بەڵکوو سێ ڕێ هەیە، لە « مەندەلیی »یەوە بۆ « زاخۆ »، ڕێی خەبات هەیە.
ـ مامۆستا ببورە، ئەو کاتەی، بەڕێزتان باسیدەکەن، خۆشم لە نێو کارەساتەکەدا بووم. ئەو شتانە، لای زۆربەی زۆری، ڕۆڵەکانی گەلەکەمان ڕوون و ئاشکران. بەڵام، من مەبەسم لە ڕۆڵی ئێوەیە، ئێوە چیتان کرد؟
ئا، ڕۆڵی ئێمە، ئەوەی، بە من کرابێ، هاتمەوە، بۆ ئەوەی « مەلا مستەفا » ببینم. کە چووم، « ئیدریس و مەسعوود »م بینیی، کوڕێ هەبوو کوژرا، لێپرسراوێکی گەورە بوو.
ـ « دارا تۆفیق ».
بەڵێ.
ـ ڕاستە، ئەو کاتە، وەزیری ڕۆشنبیریی و ڕاگەیاندن و ئەندامی کۆمیتەی ناوەندییش بوو. بەڵام، لە « بارزانیی »یەوە، زۆر نزیکبوو.
ووتیان: ڕای تۆ چییە؟ ووتم: بە ڕای من، هەرگیز، کورد ڕۆژی وەک ئەوڕۆی دەس نەکەوتووە. دەبێ، خەباتبکەین. پێویستە، لە سەر تێکۆشان بەردەوام بین. ڕاستە، « ئێران » یارمەتییمان نادا. بەڵام، چەکەقورسەکانیان، هێشتا لێرەیە. چەکێکی زۆرمان هەیە. پارەمان هەیە. من دەمزانی، شۆڕش نزیکەی، سێ میلیۆن دۆلاری هەبوو.
ـ دۆلار یا دینار؟
دۆلار، دۆلار. نزیکەی « 200 - 300 » هەزار چەکدارمان هەبوو. بە میلیۆن فیشەکمان هەبوو. هێشتا، هیچی نەبرابۆوە، هەمووی لەوێ مابوو. تا، لە نۆزدەی مانگدا بردیانەوە. کاتی خۆبەدەسەوەدانیش، سیازدەی مانگ بوو، کە شۆڕش بڵاوەی لێ بکا و کورد چەکدابنێ. گەر قەبووڵیانکردایە و شەڕیان دەسپێکردایە، زۆر کارێکی چاکبوو. ووتم: شەڕبکەن، پێویستە، هەر لە ئێستەوە، خۆمان بۆ هەموو شتێ ئامادەکەین.
« دارا تۆفیق » ووتی: ئاخر، چۆن شەڕبکەین، جەنابی « مەلا مستەفا »، وا لە « ئێران »؟ گەر بۆ مێژوو شایەدیبدەم، « ئیدریس » ووتی: « مەلا مستەفا »یەک ئامادەبووبێ، ئەو هەموو ساڵە، خەبات بۆ گەلی خۆی بکا، ئەو هەموو کوردەش، لەم شۆڕشەدا کوژرابێ، هەر لەبەرئەوەی، گیانی باوکم، دەکەوێتە مەترسییەوە، ئەو خەباتەی ئەو دەسپێکردووە، وازیلێبێنین و لە سەری

نەڕۆین؟ من، ئەمەم لا سەیربوو! ئەویش و « مەسعوود »یش، هەر دووکیان، ئاو بە چاویاندا دەهاتەخوارەوە. بەڵام، کاکە « دارا »مان، ئەوە نەبوو!
بۆ ئاگادارییت، کاکە « دارا و سالح یوسفیی » قەهرەمان! ئەندامی پەلیتبیرۆ و کۆنە وەزیری شۆڕشی کورد، کە لەگەڵ « جەمال جەلال » ناوێکدا هاتبوو، یەکەم سێ کەسی، سەرکردایەتی « پارتیی » و شۆڕش بوون، پێش ئەوەی، بە تەواویی، بڕیاری خۆبەدەستەوەدانی گشتییش بدرێ، ڕایانکردەوە بۆ « بەغدا »
ووتم: هەرچۆنێ بێ، ئیشەکە بێ « مەلا مستەفا » ناکرێ، با ڕاوەستین، تا دێتەوە. خۆی دەبووایە، « مەلا مستەفا »، پێش سیازدەی مانگ بگەڕایەتەوە.
پاشان، « مەلا مستەفا » هاتەوە. من ویستم، بیبینم. لای « جەرجیس فەتحوڵلا » دانیشتبووم. کاتیان بۆ دانابووم، « مەلا مستەفا » ببینم، چاوەڕوانمدەکرد.
ئەوەندەی پێ نەچوو، « فووواد عارف » هات. ووتی: ها « بلە »، ئەوە چی دەکەی؟ ووتم: وەڵڵا، چاوەڕوانم، وەڵامم بۆبێ، بچم، بۆ لای « مەلا مستەفا »، بیبینم. ووتی: مەچۆ. ووتم: بۆ؟ ووتی: دوو پیاوی « ئەمێریکایی و « ئێران »ی هاتوون، لێرە، « مەلا مستەفا »یان دیوە. « مەلا مستەفا »، بە خەڵکەکەی وتووە: هەموو شتێ بڕایەوە. « شا »ی دیوە. « شا » پێی وتووە: دەبێ، خۆ بە دەستەوەبدەن و چەکدانێن، لەبەرئەوە، مەچۆ، پێویست ناکا. پاشان، هەواڵم بۆ هات، کە « مەلا مستەفا » نابینم. منیش، هەستام و گەڕامەوە، کە بانگم نەکا، چی بکەم؟ ڕۆژی نۆزدەی مانگ بوو، زۆر چاکم بیرە. جارێ، سەرێکم لە پەلیتبیرۆ دا. ئەندامانی پەلیتبیرۆ، هەموویان لەوێ بوون. د. « مەحموود » و ئەوان، گاڵتەیان بەو ڕایەی من دەهات، کە دەمگووت: دەبێ، شەڕبکەین.
د. « مەحموود »، تا ئەندازەیە دەیویست، هەر یەکە، ڕای خۆی بڵێ، تەنیا بۆ مێژوو، نەک بۆ کارکردن. ووتی: با هەر کەسێ، ڕای خۆی دەربڕێ. ووتمان: باشە. لە دوای ئەوەی، یەک کاژێر، قسەم بۆ کردوون، « حەبیب محەمەد کەریم » هەستا و ووتی: « السكرتير السابق يودع السكرتير الاسبق ».
ئەو کاتە، لە ئەشکەوتەکەی « ناوپردان » بووین. هەستا، تەوقەی لەگەڵ کردم و ووتی: من خوا حافیز. لەوێ مامەوە، هەر خەریکی هەوڵدان بووم. وا دیارە، « مەلا مستەفا »، لە ڕێی هێندێ کەسەوە بیستبووی، من لەم لاو لەو لا، خەریکی قسەوقسەڵۆکم! بۆیە، وەڵامی بۆ ناردم، کە ڕۆژی نۆزدەی مانگ بیبینم. چووم، دانیشتین. « مەلا مستەفا »، هەموویانی کۆکردبۆوە. پێش

ئەوەی، ئەو دانیشتنە بکا، خۆی کۆکردبۆوە، دەستی بە وردە جوولانەوەیەک کردبوو. « ئیدریس و مەسعوود »یش، قسەیان لەگەڵ کردبوو.
ـ واتە: پێش ئەوەی، « ئەمەریکایی و ئێرانیی »یەکان ببینێ، بڕیاری بەرگرییکردنی دابوو؟
بەڵێ. ویستبووی، بەرگرییبکا. لە دانیشتنەکەدا ووتم: دەبێ، ئێمە بەرگریی بکەین. « مەلا مستەفا »، لەگەڵ ئەو ڕایەدا نەبوو. ووتم: باشە، با، لیژنەیەک دروسکەین، ئێمە، خۆمان هیچ ناکەین، با، کۆمەڵێکی تازە، ئەو کارە لە ئەستۆی خۆیان بگرن. خۆ هەر ئێمە، گەلی کورد نین، ئەوانەی دەیانەوێ، خەباتبکەن، چەکەکانیان دەدەینێ، با، خەباتی خۆیان بکەن.
تا ئەندازەیە، « مەلا مستەفا » جولابوو. بەلام، کۆمەڵەکەی دەوروپشتی، دوودڵ بوون. بیریانخستەوە، کە ئەو، کۆبوونەوەی کردووە و بڕیاریداوە چەکدانێ، تازە ناتوانێ، پەشیمانبێتەوە، هەر بە تایبەتییش، بیریانخستەوە، کە نابێ و کەس ڕازیی نییە و کەسمان لەگەڵ نییە، ڕای هەموو لایەکیش دەزانین، چییە و هەموو ئەوانەیان تێگەیاند. ئیدی « مەلا مستەفا » پیشانیدا، کە ناتوانین، شەڕبکەین و هیچمان پێ ناکرێ. من، پێمووت: ئێوە لە سیازدەی مانگەوە، بڕیارتانداوە، شەڕ نەکەن، تا ئێستە، شەش ڕۆژ دەکا. ئەوڕۆ « ئێرانیی»یەکان خەریکن، تۆپەکان دەگوێزنەوە، هێشتا لێرەیە و بە تەواویی، نەیانگواستۆتەوە، چەک و جبەخانەیەکی زۆرە، دوو پێشمەرگە، لە سەر سنوور دانێن، بڵێن: نایەڵین، بڕۆن. چونکە، « ئێران » لەوە دڵنیا نییە، کە « سەددام »، مەرجەکانی خۆی بەجێدێنێ. لەبەرئەوە، وەک تاکتیکێ، دەیویست، کەمێ دوودڵیی، لە نێو کوردا پەیداکا، تا، کەڵک لەو هەرا و بەزمە ببینێ و « سەددام »یش ناچارکا، هەموو مەرجەکانی « ئێران » جێبەجێکا. واتە: کورد، بە تەواویی نەوەستێ و چەک فڕێ نەدا. تەنانەت، د. « مەحموود.» گێڕایەوە، ووتی: « نەسیریی » پێی ووتین: بۆ لە خۆتانەوە و لێرەوە دەیبڕنەوە. بچن، لەوێ کۆبنەوە و بڕیاری خۆتان بدەن. بۆچی، لە خزمەت « شا »دا دەڵێن: هەر چی، تۆ بفەرمووی، ڕاستە و بە قسەتدەکەین.
بە کوورتییەکەی، « مەلا مستەفا »، لە وەڵامدا پێی ووتم: گەر شەڕبکەین، تۆ دەتوانی، لەم شەڕەدا چی بکەی؟ ووتم: من نازانم، تەقەبکەم. گەر چی سێ چوار مانگ، مەشقی سەربازییم کردووە، کاتێ، خوێندنم تەواوکرد و ئەفسەری یەدەک بووم. بەڵام، نیشان ناپێکم! واتە: گەر سەد گوللە بتەقێنم،

لەوانەیە، یەکێکی بەر نیشان بکەوێ. لەبەرئەوە، من لای تۆوە دادەنیشم، مەخزەنت بۆ پڕدەکەمەوە. بڕوابکە، وا زوو دوژمن، ناگاتە لای تۆ، مەگەر بە سەر لاشەی دەهەزار، پێشمەرگەدا هەنگاوهەڵێنێ. ووتی: « برایم »، تازە لە دەسچوو، کەسمان لەگەڵ نییە، من ئومێدم نەماوە.
ئەو قسانەی من، بە « مەلا مستەفا »م ووت، کاتی خۆی، ڕۆژنامەیەکی « هۆڵەندیی » بوو، یا « دانمارکیی » بوو، هەمووی نووسیی و بڵاویکردەوە. بیرم نەماوە، لە چ جێیەکدا بوو. ئێدی، لەو ڕۆژەوە، لەگەڵ « مەلا مستەفا »دا پێکهاتینەوە، هەر چی ووتووە، چ فرمانێکی پێ کردووین، هەر ئەوەمان کردووە، هیچ شتێکی دیکەی، بێ فرمانیی ئەومان نەکردووە.
ـ بە قسەکانی بەڕێزتاندا، وا دەردەکەوێ، لەو ڕۆژە پڕ لە نائومێدییەدا، کەس نەیدەتوانی، هیچ بکا.
نەخێر، کەس نەیدەتوانی، هیچ بکا. چونکە، « مەلا مستەفا » خۆی، بە گژیدا دەهات.

پ19 : ئایا، ئاگاتان، لە دامەزراندنی « یەکێتی نیشتمانیی کوردستان » هەیە؟
و19 : نەخێر. بەڵام، ئاگادارکرام، کە ڕێکخراوێکی نوێ دروستدەبێ، کە دروستیشکرا، هێندێ برادەری وەک « عومەر دەبابە، عەلی عەسکەریی و دوکتۆر خالید »، داوایان لێ کردم، بچمەوە بۆ « کوردستان ». خەریکبوو، بچمەوە، خۆشم ئامادەکردبوو. لە پاشان، وەڵامیان بۆ ناردم، گوایە: لەبەر ئەوەی جێیان نییە، جارێ هەر، لە « لەندەن » بمێنەرەوە، تا دوایی خۆیان، وەڵامم لێ دەگێڕنەوە.
ـ واتە: بەڕێزتان، دەستتان لە دامەزراندنی « یەکێتیی »دا نەبوو؟
نەخێر.

پ20 : ئایا، لە کاتی دەسپێکردنەوەی شۆڕشی نوێی گەلەکەماندا، هیچ جۆرە پرسێکیان، بە بەڕێزتان کردووە؟ یا، بە شێوەیەکی دیکە بڵێین: ئاگاداربوون لەوەی، شۆڕشی چەکداریی، لە « کوردستان »دا، دەسپێدەکاتەوە؟
و20 : من، لەو بڕوایەدابووم، دەبێ، شۆڕش بکرێتەوە. پاشان، کاک « عومەر» لێرە بوو، وەڵامیان بۆ نارد، بگەڕێتەوە. ئەویش، گەڕایەوە. کاک « عەلی و

دوکتۆر خالید ـیش، له « بەغدا » و ئەو ناوانه بوون، لەو کەسانه بوون، که گەڕانەوه. ئەوەبوو، خەڵکی « ڕایات » و ئەو ناوانه، له پێش کوردی ناوچەکانی دیکەدا، دەسیان به شۆڕش کردەوه. هەتا بیرمه، یەکێکیان « کوێخا » بوو، خۆی بۆی گێڕامەوه، ووتی: پێم وتوون: گەر دێن، لەگەڵماندەبن، وەرن. گەر نایەن، ئەوا، گەر ئێمه گیراین، دەڵێین: ئەوانه هانیانداین، شەڕبکەینەوه.

– من پێموایه، گەر به پێی خزمایەتییش بێ، بەگوێرەی پلەوپایەی ڕۆشنبیریی و خەباتی کوردایەتیی و تاقیکردنەوەی کەڵەکەبووی چەند ساڵەی تێکۆشانیش بووبێ، هەر پێوەندییتان، لەگەڵ برادەره کۆنەکانی خۆتاندا هەبووه، ئاگاتان له هەڵگیرساندنی شۆڕشەکه هەبووه. بەڕێزتان لەو ڕووەوه دەڵێن چی؟

من نامـــەم، بۆ هەر دوو لایان، وەک یەک دەنووسی، داوام لێ دەکـــردن، ڕێککەون و شەڕبکەن، بۆ سەندنی مافەکانی گەلی کورد تێکۆشن.

پ21 : هەڵوێستی بەڕێزتان، بەرانبەر ئەم ڕووداوه گرنگانەی خوارەوه، چی بووه؟ هەموو، ئەو جەنگه نێوخۆییانەی، « یەکێتی نیشتمانیی کوردستان »، لەگەڵ لاکانی دیکەدا کردوویەتی، ئامۆژگارییتان بۆیان چی بووه؟

و21 : من نازانم، شەڕی نێوخۆ، له کوێ و کوێ بووه.

– وەک ئەو شەڕانەی، نێوان « یەکێتیی و پارتیی، یەکێتیی و حسیک، یەکێتیی و پاسۆک، یەکێتیی و کۆمۆنیست ».

منی تێدا نەبووم، ئاگام لێی نییه.

– مەبەسم ئەوەیه، لێرەوه، هەڵوێستان چی بووه؟

لێرەشەوه، هیچ شتێکم نەبووه. هەر ئەوەم ویستووه، له نێو خۆیاندا، شەڕ نەکەن. نەشمزانیووه، کامیان ڕاستدەکەن و کامیان ڕاست ناکەن. بەڵام، که هاتۆته سەر ئەوەی، « پارتیی » لەگەڵ « دیموکراتی ئێران » شەڕبکا، دژی ئەو شەڕه بووم. که « یەکێتیی » وتوویەتی: ئێمه شەڕ ناکەین، به دەمیان شەهیدیان داوه، بۆ ئەوەی، شەڕی کورد له « ئێران »دا ڕوو نەدا، شەڕەکه دژی « ئێران » بکرێ، ئەوەم به چاک هەڵسەنگاندووه. « پارتیی و دیموکراتی ئێران »، لەگەڵ یەکدیدا شەڕیانکردووه، ئەوەم به کارێکی خراپ زانیووه. هەر لایه، شەڕی لەگەڵ « P.K.K. » کردبێ، دژیبووم. من ئەو کاته، له کوردستان بووم، جنێوم پێ دەدان، دەسیشم لەوەدا هەبوو، که کارەکەیان به سەرکەوتن کۆتایی پێ نەیه، تا نەڵێن: کەس ژێرکەوتووه. بێ گومان، گەر پیاوەکە

بەرانبەرم، خۆشی بیرورای، وا نەبووایە، بە قسەی نەدەکردم. بێ گومان، رای وا بووە، بەڵام، من ئەوەندەم پێ ووتن: شەرمە، بە هەر نرخێ بێ، کورد نابێ، شەڕی برای خۆی بکا، لەگەڵ خەباتکاریکی دیکەی کوردا شەڕبکا.
پ : هەڵویستان بەرانبەر، گفتوگۆکەی سالی « 1984 »ی « ینک » چی بوو؟
و : کابرایەکی « پارتی دیموکراتی ئێران »، لای ئێمە کاریدەکرد. گوایە: نوێنەری ئەوان بوو لای ئێمە. ئەم پیاوە، کاتی خۆی، لە سەردەمی « قازیی محەمەد »دا ڕۆشتبوو، لە « باکۆ » خوێندبووی. لێمان دەپرسی: لە « باکۆ » چییان پێ ووتی؟ دەیگووت: وەڵلایی، کورد، کێشەکەی ئەوەندە « بوغرنجە ! »، « سۆڤێتیی »یەکان، بۆ خۆشیان لێی تێ ناگەن.
کێشەی کورد، کێشەیەکی زۆر ئالۆزە. وەک کورد خۆشی دەڵێ: « گووریس بە ڕاستیی، ناچێتە نێو هەمانەوە » . ڕاستە، کورد پێویستی، بە چەک هەیە. ڕاستە دەبێ، خەباتی چەکداریی بکا. ڕاستە، فیداکاریی و خۆبەکوشتدانی دەوێ. بەڵام، هەر چی هێزی کوردستان هەیە، هەموو هێزەکانی، هەر چوار پارچەکەی کوردستان یەکگرن، بە شەڕ، دەرەقەتی یەکێ لە دوژمنەکانمان نایەن. لە هەمان کاتیشدا، بەبێ شەڕکردن، هیچ شتێکمان بۆ ناکرێ.
بەڵام، دیسانەوە، گەر لەو شەڕەدا، کە دەیکەین، دوژمن پێی ووتین: با ڕێک کەوین، دەبێ، گەر ئەو بستێ، دەسی درێژکرد، ئێمە، مەترێ دەسدرێژکەین، تا ڕیککەوین. بە مەرجێ، مافی خۆمان بداتێ. مافی خۆشمان، هەموو کاتێ دەوێ. ئەو پەندەی دەڵێ: « کوێرە چیت دەوێ، دوو چاوی ساغ ». قسەیەکی هیچوپووچە. من دەڵێم: « کوێرە چیت دەوێ، نەختێ تروسکایی ». ئێستە، گەر بنکەیەکمان هەبێ، بناغەیەکمان هەبێ، جێ پێیەکمان هەبێ، خەباتی تێدا بکەین، بە هەر جۆرێ بێ، شتێ لە بارودۆخی کوردستان دەگۆڕێ. هەموو داواکارییەکانی خۆت، بە جارێ دەس ناکەوێ. ئەوەتە، هەتا دەڵێن: ئێستە « P.K.K. »ش، هاتۆتە سەر ئەو بڕوایە، داوای ڕێککەوتن دەکا و بە « تورک »ەکان دەڵێ: با ڕێککەوین. دەبێ، هەرواش بڵێین. با ڕێکیش نەکەون. بەڵام، ئێمە نابێ، واز لە چەک بێنین. چونکە، هەر وازمان لە چەک هێنا، ئاشکرایە، دوژمنەکانمان چیمان لێ دەکەن.
ـ بەڵێ. ئەوانە هەمووی ڕاستن. بەڵام، مەبەسی من، لەو پرسیارە ئەوەیە: کاتێ، هەلی مێژوویی، بۆ کورد هەڵدەکەوێ، گەر لەو کاتەدا، ئەو هەلە نەقۆزرێتەوە، بۆ بەرژەوەندیی ڕێکخراوەکەت، شۆڕشەکەت، گەلەکەت، کەڵکی

لێ وەرنەگرێ، هەلەکەت، لە کیس دەچێ. ئەوەشمان لە بیر نەچێ، دوژمنیش، هەمیشە لە کاتی لاوازییدا، داوای گفتوگۆ دەکا. بە ڕای من، ئەو کاتەی گفتوگۆکەی تێدا کرا، لە کاتی « یەکەمین جەنگی کەنداو »دا بوو، « عێراق »، لە شەڕێکی قورسی بێ کۆتاییەوە، لەگەڵ « ئێران »دا تێوە گلابوو. « یەکێتیی »، یەکلایەنی گفتوگۆی لەگەڵ « بەعس »دا کرد. پارتە ڕامیارییەکانی دیکە، لە شاخ بوون، هەلەکەش لەباربوو. من لەو گۆشەنیگایەوە، داوای هەڵوێستان لێ دەکەم.
ئێ، حوکوومەتی « عێراق »، هیچی نەدا، ئەوەی نەدا، کە داوای لێ کرابوو. پاشان، ڕێککەوتنەکە سەری نەگرت، گفتوگۆ جیایە، ڕێککەوتن جیایە.
پ : ڕاتان بەرانبەر، گفتوگۆکەی ساڵی « 1991 »ی « بەرەی کوردستانیی » چییە؟
و : بە لای منەوە، باش نەبوو. ئەو گفتوگۆیەی « 1991 »یان، زۆر خراپبوو. هەر چەندە، خۆیان بیانووی بۆ دێننەوە، کە چاریان نەبوو. گەر لایەکیان، بە تەنیا گفتوگۆی بکردایە، چاکتربوو، لەوەی هەموو پێکەوە بیکەن. چونکە، هیچ نەبێ، لاکەی دیکە، ترسێکی دەخستە، نێو دڵی « سەددام »ەوە، تا، شتی زیاتر بە کورد بدا.

پ22 : دوای ئەوەی، هەر دوو باڵەکەی « پارتیی »، لە ساڵەکانی « 1966 - 1970 »، واتە: چوار ساڵ، لە یەکدییان کوشت، جا، شەڕی کوردکوژیی، یا، براکوژیی ناودەنێن، هەرچییەکی ناودەنێن، گرنگ نییە، ڕێککەوتننامەی « مارس »، کۆتایی بە هەموو شتێ هێنا و « بارزانیی »ش، لێبووردنێکی گشتیی بڵاوکردەوە، هەر دوو لای شەڕکەریش، تێکەڵاوبوونەوە، بۆ ئەو ڕۆژ و سەردەمە، تاقیکردنەوەیەکی، گەلێ سەرکەوتووبوو. چونکە، ناکۆکیی و شەڕی نێوخۆی نەهیشت.
ڕاتان چییە، گەر ئەوڕۆ، بۆ بنەبڕکردنی، هەموو ئەو ناکۆکییانەی، نێوان « پارتیی و یەکێتیی » دیسانەوە، یەکگرنەوە و پێکەوە، پارتێکی« کوردستانیی دێمۆکراسیخواز » دامەزرێنن؟
و22 : ئەو کاتەش، نەبوونەوە بە یەک پارت. ئەو کاتەش، ئەوان قەبووڵیان نەکرد، ئێمە بچینەوە و یەکگرینەوە.
ـ بەڵێ. دەزانم، تێکەڵاوبوونەوە بوو.

وایە، تێکەڵاوبوونەوە بوو، بۆ ئەو کەسانەی، ئەوان قوبووڵیانبوو. ئەوەی ئەوانیش، قەبووڵیان نەبوو، ڕەتیاندەکردنەوە. بۆ نموونە: من و کاک « عومەر دەبابە »، هیچ نەبووین لە « پارتیی »دا.
ـ مەبەسم، لە تێکەڵاوبوونەوە ئەوەیە: لە شانەیەکی خواری خوارەوە، تا کۆمیتەی ناوەندیی دەگرتەوە. بۆ کۆمیتەی ناوەندییش، بڕیار وا بوو، لە کۆنگرەی داهاتووی « پارتیی »دا باسکرێ.
بەڵێ. کۆمیتەی ناوەندیی تێدا نەبوو.
ـ بەڵێ. منیش دەڵێم: تا، کۆمیتەی ناوەندیی تێدابوو. بەڵام، ئەوڕۆ بە پێچەوانەوە، گەر بێتو، هەر دوو لا کۆنگرەیە بگرن و ڕێکخراوێکی دێموکراتیکی کوردستانیی نوێ دروسکەن، پێتان چۆنە؟
ئەم پرسیارەیان، لە کاک « نەوشیروان » کردووە، ئەو دەڵێ: ناکرێ. چونکە، بیروباوەڕیان جیایە. بە لای منەوە، بیروباوەڕیان، بۆ ئەوڕۆ نابێ، ئەوەندە جیابێ. قەیناکە، لە کوردستانی دواڕۆژدا، کە گەل بە مافی خۆی گەیشت، ناکۆکیی لە سەر پارتایەتیی و دەسەڵات دەسپێبکا. بەڵام ئێستە، کاتی ئەوەمان نییە. بە لای منەوە، کاتی ئەوەیە، یەککگرین. واتە: گەر ئەو تەباییەش بەو یەککگرتنە پێکبێ، با ببێ. من خۆم، لە کۆنگرەی « پارتیی »دا بووم، کاتێ « پارتی دیموکراتی کوردستان »، بوو بە « پارتی دیموکراتی کوردستانی یەککگرتوو » هەستام، قسەشمکرد، پەسەندیشمکرد، ئاواتەخوازی ئەوەش بووم، چ لە ڕێکخراوێکی کوردستانیی یەککگرتوودا، چ لە بەرەیەکی کوردستانیی یەککگرتوودا، هەموو لایەک یەککگرن. هیچ نەبێ، بۆ ئەم کاتە ناسکە. بە لامەوە یەککگرتن، هەنگاوێکی باشە، چارەسەری ئەم گرفتانە دەکا.

پ23 : بەرژەوەندیی نەتەوەی کورد، لە چیدا دەبینن؟
و23 : وەڵڵا، وەک خەڵک پێمان دەڵێن و خۆشمان، بە خۆمانی دەڵێین، تا ئەندازەیەکیش ڕاستە، ئێمە « خۆخۆری بیانییپەرستین ». گەر خۆخۆرییەکە، بە تەبایی بگۆڕینەوە، هەروەک « خانیی »ش دەڵێ: بیانییپەرستییەکەش بکەین، بە دۆست و دوژمن ناسین، گەر ئەوانە بکەین، بڕوامان بەوە هەبێ، کە بە تەنیا، هیچمان پێ ناکرێ، تەنیا، بە هەوڵدانی پارتایەتیی، هیچمان پێ ناکرێ، بەڵکوو دەبێ، هەموومان ببین بە یەک، ئەو کاتە، شتێکمان پێ دەکرێ. بەرژەوەندیی گەلەکەمان، پێش بەرژەوەندیی تاکەکەسیی و

بنەماڵەیی و پارتایەتیی تەسکەوە بخەین، گەر توانیمان، ئەمانە بکەین، بە هەر شێوەیە، پێی دەگەی، لە هەر رێیەکەوە بۆی دەچی، بە لای منەوە، رێی دیمۆکراسییە و ناکۆکییەکی تێدا نییە. من، بەرژەوەندیی نەتەوەی کورد، لەوەدا دەبینم. گەر ئەوانە نەکەین، مانای وایە، هەر لە سەر ڕێ و شوێنە کۆنەکە دەڕۆین و هەرگیزیش، هیچ بە هیچ ناکەین.

پ24 : ڕاتان بەرانبەر دامەزراندنی دەوڵەتێکی یەککگرتووی کوردستانیی چییە؟

و24 : دەوڵەتێکی ناسیۆنالی یەککگرتووی کوردستانیی، دانامەزرێ و لەگەڵیشی نیم. بەڵام، لەگەڵ شتێکی دیکەم. ئەویش ئەوەیە: لە هەموو پارچەکانی کوردستاندا، ئەو پارتە ڕامیارییانەی هەن، پێویستە، لە سەر بیروڕایەکی دیاریکراو یەککگرن. بە تایبەتیی، ئەوەی ڕاستەوخۆ، پێوەندیی بە ئامانجەکانی ئەوڕۆمانەوە هەیە. هەر پارتەی، کاری خۆی بکا، لە چوارچێوەی ئەو دەوڵەتانەی، تێیدا هەن. من ئەوە، بە ڕەوا دەبینم. لەوە زیاتر، شتێکی دیکە نابینم.
ئەو کوردانەی، لە دەرەوەی وڵاتیش دەژین، کۆمەڵێ یا پارتێکی کوردستانیی یەککگرتوو، یا بەرەیەکی کوردستانیی یەککگرتووی خۆیان دامەزرێنن، بەبێ ئەوەی، گوێ بە ئامانج و ئاوات و قسەوقسەلۆکی، ئەوانەی ناوەوە بدەن. ئەو پارتانەی لە کوردستان کاردەکەن، با کاری خۆیان بکەن. بەڵام، ئەم رێکخستنەی دەرەوە دەبێ، کوردستانییانە کاربکا، بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی یەککگرتووی کوردستانیی تێکۆشێ، لە دەرەوەی کوردستان داوابکەین، دەوڵەتێکی کوردیی، لە کوردستان دروسکرێ، هەوڵی بۆ بدەین، پارەی بۆ کۆکەینەوە، پڕووپاگەندەی بۆ بکەین، نوێنەرایەتیی کورد لە دەرەوەی وڵات، لە هەموو ئەندامانی، پارتەکانی پارچەکانی کوردستان بسەندرێتەوە، مافی ئەوەیان نەدرێتێ، بە ناوی کوردەوە قسەبکەن. چونکە، لە ڕاستییدا، مافی ئەوەیان نییە، نوێنەری کورد بن، ئەو کەسە، مافی ئەوەی هەیە، نوێنەری کورد بێ، کە ڕۆژێ بۆمبایەک لە « تورکیا »، بیست کورد دەکوژێ، بچێتە بەر دەم بارەگای مافی مرۆڤ هاوارکا، یەکێ لە « عێراق » دەکوژرێ، ناڕەزایی خۆی دەربڕێ. دەبێ، داکۆکیی لە مافی هەموو لایەک بکا، نەک، پشتی لایەنێ بگرێ و دژێ لایەنەکەی دیکە بێ! بە پێچەوانەوە دەبێ، بیروباوەڕێکی

کـوردسـتـانیی پاک و چاکی هـەبێ، هەوڵ بۆ دامـەزراندنی دەوڵەتێکی یەککگرتووی کوردستانیی بدا. هەموو هەوڵ و خەباتەکەش، تەنیا هەر بۆ ئەوە بێ. ئەو ڕێکخراوە، باڵوێزی ڕاستەقینەی نەتەوەی کورد بێ، هەمـوو ئەو درۆودەلەسـە خـراپانەی، دوژمنەکـانمان دەیخـەنە پاڵمـان، بە کـردەوە بە درۆیبخەینەوە، بە بیروڕای جوان و بە تێگەیشتن و ژیریی خۆمان، بۆ گەلانی سەر ڕووی زەویی بسەلمێنین، کە ئێمەش، وەک ئەوان مرۆڤین، هیچمان، لەوان کەمتر نییە، گەر کەموکوڕیی لە مرۆڤدا هەبێ، ئەوا، لە ئێمەشدا هەیە. هەموو نەتەوەیە، خەسڵەتی چاکە و خراپەشی هەیە، لە ئێمەشدا، ئەو خەسڵەتانە، وەک نەتەوەیەک هەیە. لە دەرەوە ڕووی گەشی بزووتنەوەکەمان بەو شێوەیە پیشاندەین، لە ناویشەوە، لە هەر پارچەیەکی کوردستاندا، هەلێکمان بۆ هەڵکەوت، بۆ ئەوەی، ئامانجەکانمان بەدیبێنین، یەک و دووی لێ نەکەین و لەوێوە دەسپێبکەین. یا، گەر بارودۆخەکە، لە جیهاندا گۆڕا، بەرژەوەندیی کوردی تێدا ڕەچاوکرا، هەوڵبدەین، لە هەموو کوردستاندا دەسپێبکەین. بەم شێوەیە دەتوانین، شتێ بە شتێ بکەین، بەم کارەمان، مردن پیشانی دوژمنەکانمان دەدەین، تا بە « لەرزوتا » ڕازیی بن. لە هەمان کاتیشدا، نەک ڕاستەوخۆ، بەڵکوو ناڕاستەوخۆ، یارمەتیی سەرکەوتنی، ئەو پارتە ڕامیارییانەی کوردستانیش دەدەین، تا هەنگاو بە هەنگاو، بەرەو پێشەوە برۆن. چونکە، ئێمە لە دەرەوەی وولات، بەو کارانەمان، سەربەخۆیی و یەکێتیی کوردستان نیشاندەدەین، گەر ئەوان، لە ناوەوە داوای ئەو ئامانجانە بکەن، لە بەر دەسی دوژمناندان، دەیانکوژن، ناشتوانن، بەدیبێنن، دەوڵەتانی جیهانیش، هێشتا گوێیان، بەو جۆرە داواکاریی و بیروباوەڕانە ڕا نەهاتووە. پێویستی، بە پڕوپاگەندە و چالاکیی و خۆماندووکردن و کارێکی زۆر و تەواو هەیە، کە ئێمە بڕوایان پێبێنین، تا، ئەو ئامانجانەی ئێمە پەسەندکەن. ئێنجا، کە زانیمان، ڕای گشتیی جیهانیی گۆڕاوە و ئەوەمان لێ قەبووڵدەکەن، ئەو کاتە دەتوانین، بیرێ لەو دەوڵەتە یەککگرتووە کوردستانییەش بکەینەوە. من ئاوای بۆ دەچم.

پ25 : ڕاتان بەرامبەر « P.K.K. » چییە؟
و25 : « P.K.K. » بە لای منەوە، لەگەڵ ئەوەشدا، گلەییم لە هێندێ کردارییان هەیە، پێویستیی ئەم ڕۆژەیە. چونکە، گەر مرۆڤێ، لە زیندانێکدا

گیرابێ، چواردەوری گیرابێ، ئاو نەبێ، بیخواتەوە، نان نەبێ، بیخوا، خەریکە نوزەی تێدا نامێنێ، هەر چییەکی لە دەسبێ، دەبێ، بیکا. بەڵام، ئەو ساتەی بەرانبەرەکەی ووتی: بابە! با ئەم هەرایە ببڕێنینەوە، ئەو دەبێ، ئامادەبێ و بڵێ: باشە. ئەورۆ « P.K.K. »، ئەو کەموکورییەی نەهێشتووە و دەڵێن: ئامادەین، بەبێ سەربەخۆیی و دامەزراندی دەوڵەتی کوردستان بیبڕینەوە. کێشەی کورد، بە شێوەیەکی ئاشتیخوازانە، چارەسەرکەین.
بەڵام، هێندێ کردەوەی دیکەیان هەیە، من ناتوانم، لەگەڵیان بم. واتە: لە هەموو شتێکدا، پشگیرییان ناکەم. بۆ نموونە: من لە « ئەورووپا » نامەوێ، بە هیچ شێوەیە، ئێسکی خۆمان تاڵکەین. ئێمە دەبێ، لە جیهانی دەرەوەی بگەیەنین، ئەو پیاوکوژییەی، دوژمنان دەیدەنە پاڵ ئێمە، هەمووی کردەوەی خراپی خۆیانە و هی ئێمە نییە. گەر لە ئێمەشەوە بێ، دەسکردی ئەوانە و بە هاندانی ئەوانە و ئەوان، بە زۆر بە سەریاندا سەپاندووین. چونکە، ئێمە مرۆڤی پاک و چاکین، مرۆڤی خراپمان، هەر بە قەدەر گەلانی دیکە تێدایە، زیاتر لە گەلانی دیکەمان تێدا نییە. لە هەمان کاتدا، چاکیشمان تێدایە، گەر لە خەڵک زیاتر، چاکمان تێدا نەبێ، هەرگیز، کەمترمان تێدا نییە.
بە لای منەوە دەبێ « P.K.K. »، ئەم ڕۆڵە گرنگە ببینێ. وەک باسیشمکرد، ڕۆڵەکەش دابەشکا، لە کوردستان خەباتی خۆیان بکەن، ئێشە سەرەکییەکەش، بۆ دەرەوەی کوردستان بەجێبێڵێ. پشگیریی ئەو لایەنانەش بکا، کە دەیانەوێ، بە شێوەیەکی ئاشتییانە، کێشەی کورد چارەسەرکەن.
دەوڵەتەکانی جیهان دەتوانن، یارمەتییەکی زۆری بدەن، بەڵام، من لەگەڵ هێرشکردنە سەر باڵوێزخانە و بۆمباتەقاندن و کەلوپەل شکاندندا نیم لە دەرەوەی وولات. ڕاستە، لە کوردستان کورد دەکوژرێ، ئەوەش کارێکی زۆر ناخۆشە. بەڵام، دەسەڵات چییە؟ « تورک »ەکان دژی کورد پڕووپاگەندە بڵاودەکەنەوە، گوایە: منداڵ و ژن دەکوژرێن. چواردە کەس، لە « دیاربەکر» کوژراوە، ئەوە منیش، پێم ناخۆشە، بەڵام دەتوانی، بڵێی، ئەوە شتێکە چارەسەر ناکرێ. چونکە، تۆ پەلاماری ماڵێ بدەی و بۆمبایەکی تێ فڕێدەی، نازانی، کێی تێدا دەکوژرێ، ماڵی « جاش »ێکە، ماڵێ پیاوێکە « سیخوڕ »ی بۆ حوکوومەتی « تورک » دەکا.
– ڕاستە. بەڵام، ئەو جۆرە تێبینییانە، زیاتر پێوەندیی بە شێوەی خەباتی ئەو ڕێکخراوەوە هەیە.

پ26 : پاشەڕۆژی ئەو « فیدراڵیی »یەی، ئەوڕۆ، لە « باشووری کوردستان »، لە یەکلاوە ڕاگەیەندراوە، چۆن دەبینن؟
و26 : وەڵلا، پاشەڕۆژی ئەو « فیدراڵیی »یە، بەم شەڕەوە بەندە، کە ئێستە، لە کوردستاندا هەیە. گەر ئەم شەڕە کۆتاییپێبێ، برایەتیی و تەبایی پێکبێ، کورد وەک برا، دەسی خستە نێو دەسی یەکدییەوە، دەسی دوژمنەکانمانی تێدا نەما، ئەوا، سەردەکەوین. چونکە، ئەوی دوژمنەکانمانی شێتکردووە، بە « تورک و عەرەب و فارس »ەوە، ئەم « فیدراڵیی »یەیە. گەر ئێمە بیپارێزین، ئەوا « فیدراڵیی »یەکەمان سەردەکەوێ. سەریشکەوێ، بۆ کوردی وولاتەکانی دیکە، هەنگاوێکی زۆر پێشکەوتوودەبێ.

پ27 : پاشەڕۆژی نەتەوەی کورد چۆن دەبینن؟
و27 : من، پاشەڕۆژی نەتەوەی کورد، لە پاشەڕۆژی خۆرهەلاتی ناوەڕاستدا دەبینم. خۆرهەلاتی ناوەڕاستیش، چاری نامێنێ، دەبێ، « فیدرالیی » یا «کۆنفیدرالیی »یەک، بۆ خۆی دروسکا. دەوڵەتی کوردیی، لەو دەوڵەتەی خۆرهەلاتی ناوەڕاستدا، دەوڵەتێک بێ، لەگەڵ « تورک، عەرەب و فارس ... »، هەموو پێکەوەبین، یەک مافمان هەبێ، یەک ئەرکمان هەبێ، وەک یەک، تەماشابکرێین. ئەو پێوەندییانەی، لە نێوان گەلانی خۆرهەلاتی ناوەڕاستدا هەیە، زۆر کۆنتر و زیاتر و پتەوترە، وەک لەو پێوەندییانەی، لە نێوان گەلانی « ئەورووپا »دا هەیە. بۆ ئەوان بتوانن، ئەو کارە بکەن، بۆ ئێمە نەتوانین، بیکەین؟ ئەوان، وازیان لە داگیرکردنی یەکدی هێناوە، گەر ئەو گەلانەش، واز لە داگیرکردنی یەکدی بێنن، واز لە بەکارهێنانی، زۆر و ستەم بێنن، هەموو ئامانجەکان دێنەدی.
« تورکیا »، پەند لە مێژوو وەرناگرێ. « مستەفا کەمال »، ئەو هەموو خوێنەی بە خۆڕایی ڕشت، ئەو هەموو خراپە و پیاوکوژییەی کرد، کە دۆستە خۆشەویستەکانی، لە خۆشەویستییدا، هۆنراوەیان بەسەرداهەڵدەدا و ئێستەش، بە سەریداهەڵدەدەن و پێی دەڵێن: « گورگی بۆر ». ئەو نەیتوانی، کورد لەنێوبەرێ، ئەو کوردەی، ئەو بە گژیدادەچوو، هەر ئەو کوردەیە، کە تورکەکانی ئەوڕۆ، بە گژیدادەچن. بەلام، ئێستە، سێ چوار ئەوەندەی جارانە و نەشیانتوانی، بیتوێننەوە. دەبووایە، « تورک » پەندی لە مێژوو وەرگرتایە! ئەوەتە، نە « ئێران » و نە « عێراق »، پەند لە مێژوو وەرناگرن. تەنانەت،

نەتەوەی کورد خۆشی، گەلکی لە مێژووی خۆی وەر نەگرتووە. هەموو وا دەزانن، دەتوانن، کێشەی کورد، بە گوولله و تفەنگ ببریننەوە. ناتوانرێ، بەو شێوەیە چارەسەرکرێ. لەبەرئەوە، دوارۆژی ئەو گەلانە، « برایەتیی، یەکێتیی و تەبایی »یە، وەک دوارۆژی ئێمەی کوردیش، لە پێش هەموو شتێکدا، برایەتییە، دەس لە بەرژەوەندیی خۆهەڵگرتنە، بەرژەوەندیی کۆمەڵ و گەل پێشخستنە. دوارۆژی نەتەوەی کورد، جگە لەمانە، لە هیچ شتێکی دیکەدا نییە، ئەگینا بە هیچ نابین.

پ28 : پێتان وا نییە، نەتەوەی کورد و ڕێکخراوە ڕامیارییەکان و شۆڕشە چەکدارییەکەی، بە تایبەتیی لەم ڕۆژەدا، بە هیچ شێوەیە نابێ، دژایەتی بزووتنەوەی ئیسلامیی بکەن؟

و28 : پێم وایە، گەر بزووتنەوەی ئیسلامیی، وەک پارتێکی ئیسلامیی بیەوێ، لە ڕێیەکی یاسایی و بە شێوەیەکی دێمۆکراسیی و ڕەوا، دەس بە سەر دەسەلاتی ڕامیارییدا بگرێ، دەبێ، ئازادیی بدرێتێ، وەک هەموو پارتێکی ڕامیاریی دیکە، بە سەربەستیی، چالاکیی خۆی بنوێنێ. بەلام، گەر ویستی، لە ڕێی تیرۆر و بەکارهێنانی چەکەوە کاربکا، دەبێ، بۆ پاراستنی خۆت، شەڕی لەگەڵ بکەی. جا، هەر کەس دەبێ با ببێ، حەزدەکا، برای خۆشت دەبێ! با، هەموو پارتێ مافی ئەوەی بدرێتێ، بە ئازادیی کاربکا، بە مەرجێ، نۆکەری بیانیی نەبێ.

پ29 : پرسیارێکی تایبەتیی، زیاتر پێوەندیی، بەو تەمەنە درێژەوە هەیە، کە بۆ نووسین و کوردایەتیی و کاری ڕامیاریی تەرخانتانکردووە. ئایا، خۆتان بە گوناهبار نازانن، بەرانبەر بەوەی ڕۆڵەکانی نەتەوەی کوردتان، بە بیری نەتەوەیی پەروەردە نەکردووە و هەوڵتان، بۆ دامەزراندنی پارتێکی نەتەوەیی کوردیی نەداوە؟

و29 : نەء، من بڕوام بە نەتەوەیی نییە. هەر ئەوەندە، بڕوام پێیەتی، کە وەک خەڵک بژیم. گەلەکەم، وەک گەلانی دیکە بێ، لەوە زیاتر، بڕوام پێی نییە. لە خەڵک کەمتر نیم، لە خەڵکیش زیاتر نیم. وەک خەڵک و گەلێکی دیکەی جیهان، چ مافێکی هەیە، هەر ئەوەش، بۆ گەلەکەی خۆم، بە ڕەوا دەبینم. لەمە زیاتر، نەتەوەیی نابم و نەمکردووە و ناشیکەم. بۆیە، لێی پەشیمان نیم.

پ30 : گەر ئێستە، میلی کاتژمێری تەمەن، بۆ دواوە بگەڕایەتەوە، تەمەنی بەڕێزتان، لە سەر بیست ساڵان و بەرەوژوورتر قورمیش بکرایە، جارێکی دیکە، چۆن دەستانپێدەکردەوە؟
و30 : چۆن دەسمپێدەکردەوە؟ بە چی؟
ـ بە نووسین، بە هۆنراوە، بە کوردایەتیی و کاری ڕامیاریی.
وەڵلا، لە ڕێی نووسینەوە، دەسمپێدەکردەوە. من، کاتی خۆی، بۆیە، چوومە کۆلێژی « مافناسیی »، کە ببم بە « ژۆرنالیست ». لە هیچ ڕێکخراوێکی ڕامیارییدا کارم نەدەکرد. پارتی « هیوا، ئازادیی و ڕزگاریی » و هەموو ئەوانە هەبوون، تا « ژ. ک. »، من، لە هیچ پارتێکدا ئەندام نەبووم. لەگەڵ ئەوەشدا، بەشداریی چالاکیی ڕامیارییم کردووە، هەر لە « شەشی سێپتێمبەری1930 »یەوە، بەشدارییم کردووە. ئێستەش، گەر شتێکم لا ڕوون بووبێتەوە، ئەوەیە: لە دوورەوە دەتوانم، زیاتر کاربکەم، وەک لەوەی، لە ناو ئێشەکەدا بم. بە تایبەتیی، گەر ئیش بەو جۆرە بێ، وەک ئەوڕۆ دەکرێ.

پ31 : هەر چەندە، بە تەواویی، ماندوومکردی. بەڵام، پێش ئەوەی، ماڵاوایی بکەین، دەمەوێ، دوا پرسیارت لێ بکەم. دوای « درک و گوڵ »، بەرهەمی تازەتان چییە؟ نیازتان نییە، یاداشت و بیرەوەرییەکانی ژیانی « ڕامیاریی، پێشمەرگەیی و تاقیکردنەوە تایبەتییەکانی خۆتان » تۆمارکەن و پێشکەش بە ڕۆڵەکانی نەتەوەکەمانی بکەن، تا زۆرترین کەس، کەڵکی لێ وەرگرێ؟
و31 : هیچ بەرهەمێکی تازەم نییە. بەڵام، ئێستە خەریکی نووسینی بیرەوەرییەکانمم. بزانم، چۆن دەبێ. ئەویش، بە زۆریی، خەڵکەکە ناچارم دەکەن. بۆ نموونە: یەکێکی وەک کاک « مەسعوود محەمەد »، پەرتووکێکی ئەستووری نووسیوە، نازانم، ناوی چییە؟
ـ « گەشتی ژیانم ».
چەند هەزار کرۆن، پارەی کوردی « سوید »ی تێچووە. کە ئەمە، بە زنجیرە، لە ڕۆژنامەکانی « عێراق »دا بڵاوکراوەتەوە و پارەی پێ وەرگیراوە، ووتار بە ووتاری، پارەی لە سەر وەرگرتووە. لە پاشان، ئەمە یاداشتێکە، بیرەوەرییەکە نووسیوێتی، بە درێژایی نووسینەکەی نەیوێراوە، ناوی « مەلا مستەفای بارزانیی » بێنێ، هەر دەڵێ: سەرۆکەکەیان.
ـ سەرۆکی چەکدارەکان.

بەڵێ. سەرۆکی چەکدارەکان. قەیناکە، ناوی من لە پەرتووکەکەدا نابێ، بێنێ. بەڵام دەیتوانی، ناوی « مەلا مستەفا »، بۆ جنێودان بەکاربێنێ. هەروەها، دەیتوانی، ناوی منیش، بۆ جنێودان بەکاربێنێ.
– بەڕێزتانی، بە ئەندامێکی هەرە بەرزی « پارتیی » داناوە.
بەڵێ. بەڵام، گرێی ئەوەم هەیە، من لە بنەماڵەیەکی نزمم. ویستومە و دەمەوێ، جێی گەورە بگرمەوە. « حاجی تۆفیقی پیرەمێرد »، مرۆڤێکی زۆر بەڕێز و پاک و کوردێکی دلسۆزبوو. مرۆڤێ بوو، زۆر خۆی، لە پێگەیاندنی لاواندا ماندوودەکرد. دەستی بە پشتیانەوە دەگرت و هانیدەدان. لەو ڕووەوە، منیشی زۆر خۆشدەویست. لەگەڵ ئەوەشدا، من چووم بە گژیدا. جارێ، لە چلەکاندا، ووتارێکی دووروودرێژی دژی « سۆڤیێت » نووسیبوو. پێم ووت: تۆ شەرم ناکەی، ئەم شتانە دەنووسی؟ چۆن وا دەبێ؟ هۆنراوەیەکی نووسیبوو، دەڵێ:
لە هەر سێ لاوە، شایییە بە ڕیزە
خەنەبەندانیان، خوێنی ئازیـــــزە
پێم ووت: ئەمە لە کاتێکدا دەتووت: هەر لە « کەلی خان »، تا، نازانم کوێ، خوێنڕشتنە و « بارزان »، کاولە و وایە و وایە. ئەمە لەو کاتەدا بـــــــوو، « بارزانیی »یەکان ڕاپانکردبوو، خەریکبوو، بیانگرن، بیانکوژن، « ڕووس » پەنایدان. ووتم: ئەم ماڵە، ئەم جێیە، هەر چی تۆ دەیڵێی، گەر ڕاستیشبێ، کورد نابێ، بیڵێ، با، خەڵکی دیکە بیڵێ. تۆ نابێ، بیڵێی. چونکە، تۆ ئەم هۆنراوەیەت وتووە. ئەو پیاوانە، پەنایانبردە، بەر ئەو ئازیزەی، کە تۆ بۆی دەگریایت. ئێدی نابێ، تۆ ئەمە بڵێی. توڕەبوو، ناخۆشیکرد. بۆ سبەینێ، ووتارێکی نووسیبوو، جنێوێکی زۆری بە « سۆڤیێت » دابوو. لە دوا دێڕیشدا، دەڵێ: « خوا ڕووی ئەو کەسە ڕەشکا، وەک ناوی، کە ئەم نەریتەی، بەم ناوەدا هێنا ». جا، « پیرەمێرد » دەستێکی زۆر جوانی، لە بەکارهێنانی ووشەی سەیرسەیردا هەبوو. زۆر زیرەکیشبوو. لە سەر ئەو قسانەی، من پێم وتبوو، چووبوو، لە دادگە شکاتبکا. « قازیی »، بانگیکردم، « شێخ محەمەدی خاڵ » بوو. ووتی: ئەرێ ئەوە چییە « بلە »، « حاجی تۆفیق » دەیەوێ، شکاتت لێ بکا؟ ووتم: ئەو، شکات لە من دەکـــا؟! ووتی: بەڵێ. ووتم: من، شکات لەو دەکەم، جنێوی پێ داوم. ووتی: لە چیدا؟ ووتم: وەڵڵا، لە « ژین »ی ئەوڕۆدا. ووتی: بە خوا « بلە » خوێندومەتەوە، هیچی تێدا نییە، جنێوی بە « سۆڤیێت » داوە، خۆ تۆ « سۆڤیێت » نیت؟ ووتم: باشی بخوێنەرەوە! ئەو دێڕانەی دوایی

بخوێنەرەوە. ووتی: هیچی تێ نەگەیشتم. ووتم: کاکە! دەڵێ: خوا، ڕووی ئەو کەسە ڕەشکا، وەک ناوی ... من، ناوم « بلەی ئەحە ڕەش »ە . « ئەحە ڕەشی فەتاحە ڕەشی مستەفا »م ناوە. من « بلەی ئەحە ڕەش »م. واتە: ڕووی من ڕەشبێ. چونکە، « کۆمۆنیست »یم، لەم ناوەدا بڵاوکردۆتەوە.
جا، ئەم نموونەیەم، بۆیە، بۆ هێنایتەوە، قسەکانی « مەسعوود »یش، وەک قسەکانی « پێرەمێرد »، ناناسرێنەوە. ئەو تیروتوانجەی ئەو دەیگرێ، وەک ئەوانەی « حاجی تۆفیق » وایە. تۆ نازانی، ئەوە مەبەسی منە. چونکە، دەردی کورد دەڵێ: « من فیکەی خۆم دەناسمەوە ». لەبەرئەوە، دەزانم، مەبەسی چییە. لەگەڵ ئەوەشدا، دەتوانم، بڵێم: من دەستێکی زۆر خراپم، لە دروستکردنی « مەسعوود محەمەد »دا هەبوو.
« مەسعوود محەمەد »، کوڕی « مەلای گەورە »یە. لە سەر ئەوە ناڕۆین. بۆ پێی دەڵێن، گەورە، هەقم بە سەر ئەوەوە نییە. باوکی پیاوێکی بەڕێزبوو. تا ئەندازەیە، ڕاژەیکردووە، خۆی لە پەرتووکەکەیدا، هێندێ شت دەڵێ، لە ڕێزی کەمدەکاتەوە. « مەلا »، باسی گللەیی ئەوە دەکا، کە لە « بڵاطی عێراق »ەوە، پرسەنامەی بۆ نەچووە. بەڵام، لە باڵوێزخانەی « بریتانیا »وە بۆی چووە. خوێندوتەتەوە؟
ـ بەڵێ.
بۆ نموونە: ئەم پیاوە، لە « چوارتا » بوو بە دادوەر. من وەک سکرتێری « پارتیی » پێشنیازمکرد، ئەم جارە. « نایب »ی ئێمە لە « کۆیە »، نابێ « کاکە زیاد » بێ. چونکە، خەڵک دەڵێن: « کاکە زیاد »، بە هۆی خێڵەکەیەوە دەردەچێ. « پارتیی »، لەم کارەدا دەسی نییە. « کاکە زیاد »، هەر کاتێ خۆی هەڵبژێرێ، دەردەچێ. ئێمە، با پیاوێ هەڵبژێرین، کە خۆی دەسەڵاتی نەبێ. بەڵام، ئێمە کارەکە، بە ئیشی « پارتیی » دابنێین. دوایی، لە لیستی پاڵاوتندا، ناومانووسی و سەد دیناری « تەئمینات »مکەشم بۆ پەیداکرد. بە « کاکە زیاد »یشمان ووت: خۆی هەڵ نەبژێرێ. ئەویش، زۆر پیاوانە، هاتەپێشەوە و خۆی هەڵ نەبژارد. دوو سێ کەسی دیکە، خۆیان هەڵبژارد، خزمی « کاکە زیاد » و ئەوان بوون. بەڵام، کەسیان دەر نەچوون.
با ئەمەت بۆ بگێڕمەوە. کاتێ « کاکە زیاد »، « نایب » بوو، نوێنەری ئێمە بوو. هەموو مانگێ، ڕاپۆرتێکی دوورودرێژی، لە سەر گفتوگۆکانی « نایب »ەکان و قسەی خۆی، لەگەڵ « وەزارەت »ەکاندا و شتی دیکەی نهێنیی، کە دەسی

دەکـەوت، بۆی دەناردین. کـاک « مـەسـعـوود »مـان بوو بە « نایب ». تا دوو مـانگ، نامـەیەکـی نەنارد. بە بۆنەیەکـەوە، خـۆم چووم بـۆ « بەغدا ». چاوم پێی کەوت. ووتم: کـاک « مەسعوود »، ئەوە چییە، هیچ دەنگوباسێکت نییە؟ ووتی: کـاکە! دەنگـوباسی چیم هەبێ؟ ئەمـانە، ئەوە نین، کە ئێمـە دەمانەوێ. ووتی: بڕوابکە، ئیشێکم لای وەزیری داد، « ئەحمەد موختـار » هەبوو، چوومەتە لای، لە بەرم هەستاوە، لە تەنیشتـمەوە دانیشتـووە، کە پێم وتـووە: بچۆرەوە سـەر کورسییەکەی خۆت دانیشـەرەوە. ووتی: ئەوە لایەق بە ئێوەیە، ئێوە و مـانان، ئەم کارانە ناکەن و بە ناپاکیی دەزانن، بۆیە، بۆ ئێمە ماوەتەوە. ووتـی: ئەمانە، وەک مرۆڤێکی خراپ، هەڵسوکەوتمان لەگەڵ دەکەن.

من، نموونەیەکم بۆ هێنایەوە. لێرەدا نـاتوانم، بۆت باسکەم. چونکە، ووتنەکەی نەختـێ ناشیـرینە. بەڵام، شـتێکی لەو بابەتەت بۆ دێنمـەوە، کە هەمـان واتا ببەخشێ. ووتم: « شێخ مستـەفای قەرەداخیی »، باوکی ئەو« کامەران*»ە بـە منی ووت: تۆ بۆ نەبووی بە پارێزەری « کۆمپـانیای نەوت »، بۆ نەبـــووی، بە « نـایـب ». بۆ ئەوەت نەکرد و بـۆ ئەوەت قەبووڵ نەکرد؟ ئێستـە هـێناویانی، دەسبەسەر لێرە دانیشتووی. ووتم: کاکە! من دەمزانی، ئەمە بۆچی دەکەن، بۆ ئەوەی من بفرۆشن. من ببم بە پارێزەری « کۆمپـانیای نەوت »، کۆمپـانیا چی دەکا؟ ئەوان شتێ دەکەن، دژی کرێکارە، منیش بەخێرێ، ناوم بە کۆمۆنیست ڕۆشتووە، گەر چی، هەرگیز لە « پارتی کۆمـۆنیست »دا نەبووم و ناشبم، ئێ، ئەمە چۆن دەبێ؟ دەیانەوێ، ناوم خراپ بکەن.

« شێخ مستـەفا »، هاتە لامـەوە و ووتی: بە شەرەفم، ڕاسدەکەی. دەزانی، من چیم دێ بە خـەیاڵ، لە لای ئێمـە، کـە مـرۆڤ نارەحـەتدەبێ و تاویدێ، بەو دەشتەدا دەگـەرێ، تا جێیەکی دەسدەکەوێ، دادەنیشێ و ناو سکی خۆی پاک دەکاتەوە. ئینـجا، بۆ بەردێ دەگـەرێ، ئەم لا و ئەو لای، ئەو دەشـتـە دەکا، تا، بەردێ دەدۆزیتـەوە. کـە بە بەردەکـە خـۆی پاککردەوە، هـەتا دەسـیـدەگـا، فرێیدەدا. ووتی: ئەم دەوڵەت و کۆمپـانیایانە وان. ووتم: کاکە « مەسعـوود »، ئیـشـی ئەم پیـاوانە وایە، هەڵسـوکـەوتت لەگـەڵ دەکـەن، تا، خـۆیانت پێ پاکدەکەنەوە. دوایی، فرێتدەدەن، تۆش، لەگەڵ ئێمـەدا وابووی. « مەسعـوود محـەمەد »، هەموو ئیشەکانی، لە سەر حسابی ئێمە تەواوبوو.

---

* « کامەران قەرەداخیی » ڕۆژنامەنووسێکی کوردە، ئێستە لە « بریتانیا » دەژی.

« مەلا مستەفا »ش بە تەواویی، بە پیاوی « ئەمێریکا »ی دەزانی، بەڵگە هەیە، دەتوانی، بپرسی. هەتا جاریکیان، دەچێ بۆ لای « مەلا مستەفا »، زۆر ڕێزی لێ دەگرێ. لە پاشان، « مەسعوود » ووتبووی: ئێ چییە، جەنابی « مەلا »، چیتان بە دەسەوەیە؟ « مەلا مستەفا »ش ووتبووی: وەڵڵا، چیمان بە دەسەوەیە، هیچمان بە دەسەوە نییە، هیچمان پێ ناکرێ، ئەم « رووس »ە سەگبابانە، گەر چارەکە میلیۆنێکیان بۆ بناردینایە، ئێستە، تا « بەغدا »مان دەگرت. بەڵام، ئەوانە دەیدەن و نایدەن، هەمووی، سەدهەزار دینار بە ئێمە دەدەن، سەدهەزار دینار، بە کەڵکی چی دێ؟ ووتی: خەڵکەکەی لەوێ بوون، یەکێ دەکۆکیی، یەکێکی دیکە، خۆی دەجووڵاندەوە، یەکێکی دیکەش هەڵدەسا و دەڕۆیی.
دوایی « مەسعوود » ڕۆشت. « مەلا مستەفا »ش، تا سەر جادەکە بە ڕێیکرد، کە گەڕایەوە، تەماشایکرد، لەو هەموو کەسە، دوو کەس ماونەتەوە. ووتی: دەزانم، کەرینە، بۆچی ئێوە ماونەتەوە، بۆ ئەوەی، ئامۆژگارییم بکەن، بۆچی، ئەم قسانەمکرد. ووتی: جارێ، ئەم قسەیە درۆیە. « رووس » هیچی بە ئێمە نەداوە و هیچیش نادا. ووتی: ئەم « مەسعوود »ە، پیاوی « ئەمێریکا »یە. دەچێ، بۆ « ئەمێریکایی »یەکانی دەگێڕێتەوە. هیچ نەبێ، « ئەمێریکا » شتێکمان دەداتێ.
جا، ئەوانە هەمووی، وایان لێ کردم، ئێستە، دوا ئیشم ئەوەبێ، گەر مردن مەودا بدا، گەر پێم کرا، خەریکی نووسینی بیرەوەرییەکانم بم. بۆ ئەوەی، چیدیکە بە کەموکووڕتیی، لەم لا و لەو لا، بە خراپە باسمان نەکەن و شتمان، بۆ هەڵ نەبەستن.
ـ کەواتە: بەو زووانە، چاومان بە بیرەوەرییەکانی بەڕێزتان، ڕۆشندەبێتەوە؟
بە خوا، شتێکی گرانە، ناتوانی، هەموو ڕاستییەکان بدرکێنی. گەر هەموو ڕاستییەکانیش نەڵێی، جوان نییە. هەموو ڕاستییش بڵێی، ڕەنگە، گێرەشێوێنیی تێدابێ. گەر چی، بۆ مێژووی بەجێدێڵین. بەڵام، لەبەرئەوەی، هێندێ هەڵە، لە مێژوودا هەیە، لە مێژووی ئەو کەسانەدا کە نووسراوون، لەو بیرەوەرییانەدا کە نووسراوون، چ پێوەندیی بە خۆمەوە هەبێ، چ پێوەندیی بە خەڵکی دیکەوە هەبێ، کە من ئاگام لێ بووبێ و دەیزانم، ئەوە وا نەبووە، لەبەر ئەوە، بە پێویستم زانی، منیش وەک بیروڕای تایبەتیی خۆم، تۆماریان کەم. مەرجیش نییە، تەواوبێ، چونکە، هێندێکیم بیر نەماوە. مەرجیش نییە،

وا بێ، چونکه، من چۆنم بینیون، له باری سەرنجی خۆمەوە، باسیاندەکەم. ئەنجامەکانیشی، هەمووی دیارن. مەرج نییە، لێکدانەوەکانی ئێستەشم، بایەخێکی ئەوتۆی هەبێ، چونکە، ئەو ڕایە حسیبە، کە لە کاتی خۆیدا بووتە.
ـ له کۆتاییدا، زۆر سوپاستاندەکەم. بە ڕاستیی، دانیشتنێکی خۆش و بە کەڵکبوو. داوای لێبووردنتان لێ دەکەم، بەو هەموو پرسیارە زۆر و دوورودرێژانە، بە تەواویی، ماندووەکردن. هیوادارم، کاتێکی دیکە، پێک بگەینەوە، تا زیاتر، لەو باسانە بکۆڵینەوە. جارێکی دیکەش، داوای لەشساغیی و تەمەندرێژیی و سەرکەوتنتان بۆ دەکەم.



## ڕێباز محێدین

# جاش یا باش !

ڕەنگە بۆ گەنجێکی وەک من تازەپێگەیشتوو، ڕەخنەگرتن لە کەسێکی وەک برایم ئەحمەد، لە جێگەی خۆی نەبێ بەتایبەتی کە ئێمەی نەوەی نوێ ڕێگەی تەبایی و بەیەکەوە هەڵکردنمان کردۆتە دروشمی سەرکیمان.
ڕاستـیش من خـۆم هەرگیـز ئارەزوی ئەوەم نەبووە لە ڕوی مـرۆڤـێکی بەساڵاچوو هەڵسمەوە، لێ بەداخەوە! نامیلکەی (پێنج کاتژمێر لەگەڵ برایم ئەحـمـەد دا )* ئەو نەریتـەی پێشاکـاندم، بەتایبەتی دوای ئەوەی لە خوێندنەوەی بوومەوە و؛ لە خۆم پرسی تۆ بڵێی مـرۆڤی کورد لەم تەمەنە و دوای ئەم هەمو ئەزمونە تفتوتاڵ و بەسۆیە و سەرەڕای ژیانی دنیادیتەیی و چەندین ساڵ تێکەڵی کۆمەڵگەی ئەوروپا هێشتاش سوربێ لەسەر هەڵە و شێواندنی گێڕانەوەی مێژو بۆ نەوەیەکی نوێ و، بەم هەنگاوەشی بکەوێتە کوێر کـردنەوەی تولەڕێی لێبوردن و خـامـۆشکردنی دوا پشکۆی سـۆزی مـرۆدۆسـتـانەی لە دڵ و دەرونی ئەم نەوە نوێیـە ! مـخـابن، نەدەبوو برایم ئەحمەد ئەو ڕێگەیە تەی بکات.
کۆشام پێنوسم لەوبابەتەدا نەگێڕم، نەک تەنیا لەبەر هۆی گۆڕینی ئەو چەند دێڕەی سەرەتای ئەم باسەم پێدەستپێکرد. بەڵکو لێکدانەوەم بۆ ئەمەش کرد، کەنوسینی بابەتێکی وا بۆی هەیە ببێتە هۆی گۆڕینی ئەو لاپەڕانەی کە برایم ئەحـمـەد خـەریکە وەک ( بیـرەوەری ) دەیان نوسـێتـەوە. چونکێ ترسی هەڵدانەوەی لێفەشرە لە ڕوی قسەکانی برایم ئەحمەد، دوور نییە وای لێ بکات بەو ئامانجەی چاکتر خۆی لە ئاوەکە بیپەڕێنێتەوە. هەوڵی ئەوە بدات بیـانوی تازە و پینەوپەڕۆی نوێ بۆ بیـرەوەرێکانی بدرووێت. هەرچەندە لەو باوەڕەدام، گەورەترین بیانو بچوکترین ڕاستی پێ ناشاردرێتەوە.

خوێنەری هێژا !
هەڵبەتە برایم ئەحمەد لەنێو کوردان ناوێکی ناسراوە. وەک یەکێ بەیەکێ بڵێ: چا کێبێ و نەیناسێ؟ بەڵام بەداخەوە ناو و ناوبانگەکەی برایم ئەحمەد بەخراپ ڕۆیوە.خۆیشی ئەوە لە هەموو کەس چاکتر دەزانێ، هەر بۆیە ئەوەتا خۆی دەڵێت :
( خەریکی نوسینی بیرەوەریەکانم بم، بۆ ئەوەی چیدیکە بەکەموکورتی لەم لاو لەولا بەخراپەباسمان نەکەن و شتمان بۆ هەڵنەبەستن)لا ٩٠ پێنج کاتژمێر لەگەڵ برایم ئەحمەد دا
گەر هاوڕێم هاوڕێ نەکرم * دژ نەبێ لە دووبارەکردنەوەی ئەو پەندە ( پەتکی درۆکەر لاستێکیشبێ هەر کورتە ! ) بەم شێوەیەی کە خۆی دایڕشتۆتەوە، ئەوا دەڵێم هەڵبەستن و بوختان زۆر بەخێرایی هەڵدەوەشێتەوە، خراپەش هەروا بەمل کەس دانایەت، بەتایبەتی بەڕادەیەکی,وا مرۆڤ ناووناوبانگی خراپەکاری لەروبەرێکی گەورەی وەک کوردستان و تا ڕادەیەک لەسەر ئاستی جیهانیش تەشەنەبکات. وەک وتراوە ئەم ماستە بێمو نییە.
هەرچەندە ئێمە لە سەدەمێکدا دەژین هەروەک سەردەمی کۆمپیتەرو گەشتی ئەستێرەدوورەکانە، سەردەمی غازی یشە، دەزانین غازی یش کەدەسوتێ دوکەڵەکەی بەچاو نابینرێت گەر یەکێک شالاوی ئاگرە گەورەکەی باوەگوڕگوڕی بەچاوی خۆی نەدیتبێ، دوور نییە باوەڕنەکات غازی یش هەر کە ئاگری گرت دوکەڵ دەکات، نوسین و ئاخافتنی کەسێکی وەک برایم ئەحمەدیش لەروانینی کەسێکی نەشارەزا وەک غازی دوویە* وایە بێدوکەڵە! چونکێ بەپرۆسەیەکی کیمیایی دا ڕۆیوە. لێ چاوی شارەزای بە ئەزموون لەوە دەکات، کە مرۆڤ هەرچەندە هەوڵی شاردنەوەو پینەو پەڕۆ بدات لەبەر چاوان خۆ ناشیریتر دەکات. لەکاتی قسە کردندا رەنگە ئەوەی ئەو بە پینە و پەڕۆی رازاوەی بزانێ لە دیمەنی داڵ ( شەموله )ێکی پتر لێ نەکەوێتەوە.
ئەزیش، وەک زۆربەی هەرە زۆری لاوانی نەوەی دووەمی ئەم نیوەسەدەیە گوێم ئاشنای ناوی برایم ئەحمەد بووە و زۆرم لەسەر بیستوە و، رەنگە هەندێ لەو شتانە ڕۆژێ لە ڕۆژان بشێ ببنە گێڕانەوەی کەموێنەو بیرەوەری سالانی شەست و بەرەو سەرەوەتر. لێ ئاشکرایە هەرگیز لە نزیکەوە نەم ناسیوە هەرچەندە لە سالی حەفتاوچواردا چەند هەنگاوێک دورلەیەکترییەوە دەژییان، بەلام وەک وتراوە هەر یەک لە مالی خۆی. بۆیە ناشێ خوێنەری ئەم نوسینە

دڵی بۆ ئەو ەبچێ کـە شتـێکی تایبـەتی هـاندەری نادیاری ئـەم نوسـینەبێ. بێجگە لە گەیشتن بەڕاستی.
بابڵـێین منیش وەک خـەڵکانی تر لەو ڕۆژانەدا نـاووناویانگی برایم ئـەحمـەدم بیستوە، بەڵام کە نەختـێ تەمەنم هـەڵکشـا و توانای ئەوەم پەیداکرد بەچاوی خۆم نەک هـی خـوازراوە دەوروبەر و بە بیری خـۆم و نە خـەڵکی تـر سـەرنجی شتەکان بدەم و هەڵیان سـەنگێنم، زوو لەوە گەیشتم کە زۆرجـار پارتایەتی و بواری ئایدۆلۆژی هونەری ڕەسـەن و کەسـایەتی ڕەسـەن دەکـەنە قـوربانی و بەرهەمی بێبایەخ لەڕوی هونەر و جـوانکـارییەوە بـەرز و بڵند دەکەنەوە، بەبێ ئەوەی بیر لەوە بکەنەوە کە ڕۆژێ دێ دیمەنی خۆراوا و خۆرهەڵات هەرچەندە ڕەنگیشـیان لە یەکـتری بکات بە سـانایی جیادەکرێنەوە و هونەری ڕەسـەن و پاشکۆش لە یەکدی دەردەهاوێژرێن.
لەمەوبەر لەسـەر ڕوپەری گۆڤاری دلانپار، ئەمەم وتوە : کە چیرۆکەکەی « ژانـی گـەل »ی برایم ئـەحـمـەد، لە فلیمـێکی شـارلن شـاپلن وەرگیـراوە!! دەمێکە من ئـەو ڕاسـتـیـیـە دەزانم، لـەو دەمـەشــەوە بەپێـچـەوانەی زۆر خـەڵکی تـر لەوە گەیشتووم کە مامۆستا ئەو ئەدیبە پایە بەرز نیە. وەک لایەنگرانی حیزبایەتی دەیانەوێ بیسـەلمێنن. بەداخـەوە بەلای حیزبەکانەوە هەر بەرهـەمێکی هونەری خاپەرۆکیش بێ، گـەر لە خزمـەتی ئامانجی حزب بێ، دەهۆڵ و زوڕنای زۆری بۆ دەکـوترێ هەرچـەند هەمـومـان زۆر چاک دەزانین ئامـانجی حـزب چـەندە گـەورەش بێ کاتییـە نەک هـەتاهـەتایی، ئەگـەر وا نەبوایە هیچ حـیزبێک پەیڕەو پڕۆگرامی خۆی دەستکاری نەدەکرد و نەی دەگۆڕی!
بۆ ڕونکردنـەوەی پتـر دەڵـێم ڕەنگە هـەمـوتان ئەم فلیـمـەی شارلی شـاپلنتـان دیبێ، بەڵام دیارە مـەرج نیـە بینـەری ئاسایـی هـەست بەوە بکات کە ڕەخنەگر هـەسـتـی پێـدەکـات. بینـەری ئاسـایی لەبەر پێکەنـین و جـولەی هونـەری پڕ ئەفسـوناوی هونەرمـەندی بلیمـەت بەوە ڕاناگات بیر لە سیناریۆ و تـەکنیکی بەرهەمی هونەری ( فلیم ) بکاتەوە.
بۆیە بە چاکی دەزانم بەکورتی باسی ئەو فلیمـەی شارلی بلیمەتتـان بۆ بکەم:
شارلی « قارەمانی فلیمەکە » لە شەقامێکدا ڕێ دەکات، لۆریەکی بارهەڵگر لە تەکـیـا ڕەت دەبێ. ئەو ئالایەی ( هـەڵبـەتە ئەمـە ئالانییـە، بەڵکو پارچـەیەکی سورە لە دارێک دەدرێت بەچەشنی ئالا) بۆ ئاگـادارکـردنەوەی شـوفـێـران یا ڕێبـواران بەسـەر بـارەکـەوە چەقـاندویەتی دەکـەوێ، شـارلی ئالاکـە

هەڵدەگرێتەوە. لەو چرکەیەدا لەوسەری شەقامەکەوە خۆپیشاندان بەرەو ئەو شوێنە دێن شارلی لێ وەستاوە و ئاڵاکە بەرز رادەوەشێنێ بەڵکو شوفێری لۆریەکە ئاگاداربکاتەوە! خۆپیشاندانیش کەبەر شاڵاوی پۆلیس دەکەون و رادەکەن، دیمەنێکی وا دروست دەکەن وەک ئەوەی شارلی بێئاگا لەوەی لە دواوەی رودەدات بەخۆ ئاڵاوە سەرکردەی خۆپیشاندانەکە بێ ..... شارلی بێئاگا لەهیچوخۆڕایی دەستگیردەکرێت و بەتومەتی سەرکردایەتی کردنی خۆپیشاندانەکە ڕاپێچی زیندان دەکرێت .... لێرە بەدواوە زنجیرە روداوەکانی زیندان دەستپێدەکەن ..... ئەمە ئەو کۆڵەکە و چەرمەکە و دارە ڕێیانەی شارلی یە کە برایم ئەحمەد ڕێک هاتووە و روداوەکانی« ژانی گەلی » لەسەر بنیادناوە!! جا نازانم بەرهەمەکانی تری لە کوێوە هاتتون، بەڵام ئاکاری وای هەن مرۆڤ بخاتە گومانەوە.

یادی بەخێر مام هێمنی خۆمان زۆر بەسەلیقە و قسە خۆش بوو، زۆرجار سەرشانی خۆی تەکادووە و گوتویەتی:ـ کوڕینە فریام کەون شانم شکا!! خێرە مام هێمن؟ کوڕینە ئەم موحەمەد جەزایەم لەسەرشانی داگرن، بەخودای هیلاکی کردوم!! مەبەستی ئەوە بوو موحەمەد جەزا لەسەرشانی شیعرەکانی ئەو نێوبانگی کردوە، دەنا دەنگخۆش نییە، برایم ئەحمەد بەپێچەوانەوە لە سەرشانی مامۆستای نەمر تایەر تۆفیق و دەنگە خۆشەکەی ئەو « شیرین بەهارەکەی » دەنگیدایەوە، تا ئەو رادەی ناوی ئەم هۆنراوەیە زیاتر لەگەڵ ناوی مامۆستای نەمر تایەرتۆفیق دێت تا برایم ئەحمەد، راستییەکەی ئەوەی شیرین بەهارە لەبەر دوو هۆ'لای خەڵکی خۆشەویستە. یەکەمیان ئەوە بو باسمان کرد، دووەمیشیان، ئەمەیە: کە وا باوە ئەم هۆنراوەیە وەک دیاری بۆ کەسایەتییەکی وەک مستەفا بارزانی نێردراوە. ئەو دوو کەسایەتییەش سەنگ و دەنگ و ڕەنگی تایبەتی خۆیان لەسەرتاپای کوردستاندا هەیە. بێگومان لەم لاپەڕانەدا بەوە راناگەم تاوتۆی بەرهەمی هونەری و ئەدەبی برایم ئەحمەد بکەم، ئەوە بواری تایبەتی خۆی هەیە و ئێرە جێی نییە. بۆیە وا بزانم چاکترین هەڵسەنگاندنێکی برایم ئەحمەد کە کرابێت وەڵامەکەی کاکەم بۆتانی لەمەخۆمانە. کە زۆر بە داخەوە دورەدەستە، بەڵام دەشزانم ناشێ کەسێ لەوەدا لۆمەم بکات، کە ئێمرۆ لەتوانادا نییە دەستم بگاتە ڕۆژنامەیەکی بیست ساڵ پتر بەر لەئێمرۆ! بەڵام وەک لە یادم بێ وەڵامەکەی لاوی سەرسپی، ئەوەبو:

(خسرناه ادیبا، و لم نربحه سیاسیا) واتە: وەک ئەدیبێک لەدەستمان چو، وەک سیاسیش سودمان لێ نەدیت.
هیوادارم بەچاکی و بێهەڵە، دەقاودەق وەک خوێم نوسیبێتەوە.
ئەم گوتەی کاکەمی سەربەفرین! مەزنترین حوکمی مێژوە دەرحەق بە برایم ئەحمەد دەرکرابێ، ئەوندە جەرگەی راستی پێکاوە نەبێتەوە. دەبوایە بۆ برایم ئەحمەد ببێتە دەرزێکی گەورە و سودی لێ وەرگرێ! بەڵام بەداخەوە ئەوەتا برایم ئەحمەد بە زمانی خۆی دەڵێ مرۆڤ پەند وەرناگرێت! گەر ئەو گوتەیەشی وەک وتەیەکی رەها وەرگرین، زۆر راستە چونکێ سەرلەبەری نامیلکەکەی ( پێنج کاتژمێر ... ) ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێ کەبرایم ئەحمەد هیچ پەند و دەرسێکی لە تاقیکردنەوەکانی خۆی وەرنەگرتووە! ئەوە لە کوردەوارید پێیدەڵێن : سەیرە لە کۆیە!!
ئاشکرایە!
مێژوو بە کەس ناشێوندرێت، رۆژێ دێ راستی وەک خۆری درەوشاوەی ئاسمانی بێگەرد دەرکەوێت. برایم ئەحمەد وەک خۆی دەڵێ؛ پارێزەرە، پارێزەریش دەبێ بکوژ لە سزا رزگابکات ، هەڵبەتە بە درۆ و پینە و پەرۆ، هەر چەندە ماندوبونێکی زۆری داوەتە بەرخۆ و پینەوپەرۆیەکی چاک بۆ خۆی بکات ـ دۆم بێ و کڵاش بۆ خۆی بچنێ ـ دەبێ کڵاش نەبێ و کڵاوێ بۆ سەری ئەو نەوە نوێیەی لەگەڵ ئەو هەموو دەردوبەلایەی لە سەردەستی برایم ئەحمەد و نمونەی ئەو بەسەری هێنراوە هێشتا چاوی لەوەیە دوو قسەی راست و خێریان لێ ببیستێ(١)
بەڵام وەک دەڵێ ( پارێزەر و پیاوکوژ ) نەک هەر خۆی پێرزگار نەکراوە، بەڵکو بە دەیان بەڵگەی خراپەکاریشی بە دەستەوەداوە. وا باوە دەڵێن بکوژ دەگەرێتەوە سەر شوێنی تاوانەکەی خۆی. جا گەر کەسێکی ناسراو بێ دیارە گەر جلوبەرگیشی بگۆرێ هەر دەناسرێتەوە، برایم ئەحمەد لەو چاوپێکەوتنە کتومت وای لێ بەسەر هاتوە. هەر چەندە هەوڵیداوە ماسکێکی تابلێی چاکە خوازانە بەروی خۆیدا بدورێت، بەڵام وەک ئەکتورێکی میکیاژ نەزان لەجیاتی شاردنەوە پتر روی خۆی ئاشکراکردوە، بەڵگەی ئەم هەڵسەنگاندنەم ئەو خالانەیە کە لێرەبە دواوە لێیان دەدوێم. برایم ئەحمەد دەڵێت:
( لە ساڵی ١٩٦٤ دا لەگەڵ حکومەت رێک کەوت « مەبەستی لە بارزانییە/ر »، هیچیشی دەستە نەکەوت، کەچی کەسیش پێ نەدەگوت جاش! برادەرانی

ئێمە لە ١٩٦٦ دا، گوایە لەگەڵ میریدا ڕێک کەوتن، من لەوێ نەبووم هێشتا لە تاران بوم، زانکۆی سلێمانی کرایەوە، نەورۆز بو بە جەژنێکی نەتەوەیی، ناوی کورد و کوردستان دەهاتە پێشەوە، کەچی سەرەڕای هەموو ئەمانەش هینەکەی ئێمە بوو بە جاشی و هینەکەی ئەو بوو بەباشی !) ل /٤٦ سەرچاوەی پێشو.

جارێ من ناچمە نێو ئەو کێشەیە: چۆن دەکرێت ئەم ڕێککەوتنەی ١٩٦٦ بەبێ پرسی برایم ئەحمەدکرابێ؟

قسەی من لەسەر ئەوە دەبێ کە چۆن دەشێ کاک برایم تاوەکو ئێستە تێینەگەیشتبێ جاشایەتی چییە؟ یا خەڵکی کوردستان بە ساویلکە و نەفام تێدەگات؟ ئەگەرچی لە کوردەواریدا هین هەر هینە و، باش هەر باشەو جاشیش هەر جاشە، بەلام بەپێویستی دەزانم تاریفێکی کورتی جاش بکەم.

کورد بە کێ دەڵێ جاش؛؟ خەڵکی کوردستان بەو کەسە یا لایەنە یا پارتەی لەگەڵ حوکمەتدا سەودا بکات و چەک هەڵبگرێت و تەقە لە وانە بکات کە بە چیاوەن، جا هەرکێ بن و هەرچی بن، دەڵێ جاش! جاش ئەوەیە: چەک بۆ حکومەت هەڵبگرێت، بەچەکی حکومەت بجەنگێ. هەر لەبەر ئەم هۆیە ساکارەی کە بارزانی نەچووە لە بەغدا دانیشی و چەک لە حکومەتی عێراق وەرگرێت، تەقە بە شاخەوە بنێت، خەڵکی کوردستان بە « باش » ی لە قەڵەمدەدەن، لە بەر هەمان هۆی ساکاریش ئەوانەی کار و کردەوەی ئەوتۆیان کردبێ بە « جاش » یان لە قەڵەمدەدەن. جا با هەزار ڕێککەوتنیان لە گەڵ میری مۆر کردبێ نەک لە سەر ئەم چەند دەستکەوتانەی کە کاک برایم لەدوتۆی وتەکانی دا دەیان ژمێرێت، بەلکو لەسەر بەهەشتی سۆسیالیزمیش بێ ئەوە هەر « جاش » یان پێدەڵێن.

ئەگەر دیموکرایەتیش لە کوردستان بەر قەراربێ و ریفراندۆمێک بۆ دەنگدان ساز بکرێت لەسەر « جاش » و « باش » ئەوا خەڵکەکە لەو هەڵسەنگاندنەی سەرەوە بەولاوە پێوەرێکی تریان نابێ.

وادیارە کاک برایم دوای ئەم هەموو تاقیکردنەوە تاڵە هێشتاش بەتەمایە جارێکی دیش سەر لە نەوەی نوێ بشێوێنێ و جاشی لێ بکاتە باش و باشی لێ بکاتە جاش! گوایە ئەوان ڕاستبوون و خەڵکی کوردستان هەڵەبوون.

ئەمەش کارێکە هەروا ئاسان نییە. لێ وا دیارە کاک برایم هەروەک خۆی دەڵێ چ باوەڕی بەپەند وەرگرتن نییە، ئاشکراش بە وتەکانیەوە ڕادیارە کە لەو

ئەمەنە تاڵە پڕ تاقیکردنەوەیەی خۆی چ پەندی لە ژیان و ئەزموونی دوورودرێژی وەرنەگرتووە. ئەو هەرچەندە زۆر لەسەر ئەوە دەڕوات کە مرۆڤ ئەستەمە پەند وەرگرێت و نمونە یەک دێنێتەوە کە چ پەیوەندی بە مێژوو و تاقیکردنەوەی مێژووەوە نییە(نمونەی کابرای چگەرەکێش)* چونکێ مرۆڤ کاتێک کارێک دەکات کە زیانی خۆی تێدایە بەپلەی یەکەم، جیایە لەگەڵ کەسێک کە کردەوەکەی پەیوەندی بەچارەنوسی ملیۆنان مرۆڤەوە هەیە، ئەمە دوو شتی زۆر لەیەکتری جیاوازن. بەداخەوە لە کۆتایی قسەکانیدا ئەو نمونە و پاساودانەوەیە لە بیر دەکات و دەڵێت :

(دەبوایە تورک پەندی لەمێژوو وەرگرتایە، ئەوە تا نە عێراق و نە ئێران پەند لە مێژوو وەرناگرن، تەنانەت نەتەوەی کورد خۆیشی، کەڵکی لە مێژووی خۆی وەرنەگرتووە)ل٨٥ سەرچاوەی پێشو.

لێرەدا من حەقم بەسەر فارس و تورک و عەرەبدا نییە پەند وەردەگرن یان نا، ئەمەیان بۆ کاک برایم بەجێدێڵم نەختێ ئامۆژگاریان بکات بەڵکو هۆشێکیان دێتەوە بەر و داخوازییەکەی بەجێ دێنن. ئەو جا لە مامۆستا دەپرسم :

کورد کە ئامۆژگاری کاری وەک تۆی هەبێ چۆن پەند وەردەگرێت؟ کە کەسێکی وەک تۆ دوای ئەم هەموو ساڵە پەندی وەر نەگرتبێ و باوەڕی بە پەندوەرگرتن نەبێ و پڕوپاگەندەش بۆ باوەڕەکەی بکات، چۆن دەشێ داوا لەخەڵکی تر بکات پەندوەرگرن؟ لە کاتێکدا سەرتاپای ژیانی خۆتان تەرخان کردووە وەک نمونەی مرۆڤێک کەپەند وەرناگرێت، بەچ ڕوویەکەوە دەبێ لۆمەی خەڵکی تر بکەن؟ پێشینان وتویانە: ــ لە خەڵکی عادەتە و لە خۆم عیبرەتە!

کاک برایمیش پێی وایە خەڵکان دەبێ پەندوەرگرن! بەڵام ئەو بۆخۆی چۆن بوە هەروا دەبێ.

لەگەڵ ئەوەی مامۆستا گەلێکیش دژی پەند و پەندوەرگرتنە، لە سەرەتا تا کۆتایی خۆی لەهێنانەوەی پەندپاراستووە، بەڵام لە دوایدا چاری نەماوە پەندێکی کوردی بەسەریدا زاڵبووە، ڕەنگە لەبێ ئاگایی بێ کە دەڵێ : گوریس بەراستی ناچێتە ناو هەمبانەوە. ڕەنگە ئەمەیان شکستێکی گەورەی مامۆستا نەبێ بەڵام بێگومان سەرکەوتنێکی گەورە بۆ پەندی کوردی تۆماردەکات. هەر لەو ڕوانگەوە دیسا ڕەخنە لە پەندێکی کوردی دەگرێت : کوێرە چیت دەوێ؟ دوچاوی ساغ ..*بەڵام ڕەخنەکەی لەو پەندەشی گرتووە بەرەواژە، چونکێ ئەو هەر خۆی دەڵێ: ئەگەر بتەوێ مافی خۆت وەربگریت دەبێ داوای پتر بکەیت،

تا ئەوەی دەتەوێ وەریبگریت. کەچی بەداخەوە دەڵێ : کوێرە چیت دەوێ؟ نەختێ تروسکایی !* لەکاتێکدا دەبوایە بڵێ : کوێرە چیتدەوێ دووچاوی ساغ و زەرەبینێک! تا ئەوجا نەختێ تروسکایی یا هەر نەبێ چاوێکی ساغی پێ ببڕێت. ئەوەش بەسە بۆ سەلماندنی ئەوەی مامۆستا لە پەند نەگیشتووە، دیارە پەندوەرگرتنیش لە یەکێک داخوازی دەکرێت کە لە پەند گەیشتبێ. کە دەشڵێت ئەو دژی پەندە، مەبەستی ئەوەیە : کە ئەو چۆن بوە هەروا دەبێ و هەرواش دەژیت، لە قسەی خۆی نایەتە خوارێ ! ئەمەش هەر راستی ئەو پەندە کوردییەمان بۆ دەسەلمێنێ کە دەڵێت : خۆی شیری هەتا پیری !! *
جا با گەڕێنەوە لاپەڕەکانی بەرایی و بزانین برایم ئەحمەد چۆن بووە؟
برایم ئەحمەد هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی ئاخافتنەکەی، گەرەکێتی ئەو هبسەلمێنێ کە ئەو بەهیچ جۆرێک دژایەتی بارزانی نەکردووە، بەڵکو بارزانی خۆی وا تێگەیشتووە، یاخود وا تێگەیە ندراوە کە برایم ئەحمەد دژایەتی دەکات؟

بە مانایەکی تر ئەوەی لەم چل ساڵەدا بەسەر کوردا هاتووە ئەنجامی نا تێگەیشتووی و بەسەهوچوونی بارزانی بووە!! تۆ بڵێی بارزانی دوای ئەم هەموو تاقیکردنەوە و ژیانی پڕ لە چەرمەسەری و دەربەدەری و هێندەهۆش و گۆشەی پەیدا نەکردبێ لەدوڕا مەعدەنی مرۆڤ بناسێت و هەروا لەخۆڕا یا لەبەر هۆیەکی دەرونی یا نادیار، یا مرۆڤێکی هێندە ساکار بێت بەقسەی ئەم و ئەو هەڵخەتا بێت؟ نەخێر !
راستییەکەی ئەوەیە کە کاک برایم هەر لەسەرەتاوە کاتێ لە ریزەکانی پارتیدا کاری کردوە پێش هەموو شتێک، دژایەتی بارزانی کردۆتە سەری رمی هەموو بیر کردنەوە و کار و بڕیارێکی، هەتا لەو رۆژانەی کەبارزانی دەربەدەر و ئاوارەی یەکێتی سۆڤیەت بوو. ئەو خۆی دەڵێ: (من یەکێک بووم لەوانەی نارەزایم هەبو لەوەی مەلا مستەفا هەر لە دورەوە سەرۆک بێ)ل٥١ سەرچاوەی پێشو ( پێنج کاتژمێر ..... )
برایم ئەحمەد بۆ بە راست گەڕانی ئەم بۆچونە کە لەدروستکردنی خەیاڵی خۆیەتی کۆمەڵێک بیانو دێنێتەوە، کە هیچیان بایی ئەوە نین راستی بۆچونەکەی بسەلمێنن. بەڵام با ئێمە لە خۆمان و لە نەوەی ئەو سەردەمیش بپرسین؛ ئایا بارزانی لەو قۆناغەدا چ پێویستی بەوە هەبوو کەس پێشنیاری سەرۆکایەتی بۆ بکات؟ ئایا بارزانی کە تاکە کەسێک بوو لە کۆمارە

جوانەمەرگەی ١٩٤٦دا هەموو داگیرکەرانی کوردستان سەریان لەدوونابوو پێویستی بەوە بوو خەڵک دەنگی بۆ بدات؟ ئەی ئەوەنییە برایم ئەحمەد هەر خۆی دەڵێ: (خەڵکی وا هەبو لە سلێمانی دەیان گوت بارزانی بێتەوە دەبینە پارتی) ئەمە نیشانەی خۆشەویستی جەماوەر نییە بۆ بارزانی؟ سەرەڕای هەموو ئەوەش با کەسێکی زۆر لە برایم ئەحمەد نزیک، کە جەلال تاڵەبانییە و نێراوی رەسمی پارتیە، نەک کەسێکی ئاسایی بکەینە بەڵگەی چۆنییەتی بیرکردنەوەی ئەوەی ئەو سەردەم و بزانین چۆن بارزانی دەئاخاوێنێ. جەلال تاڵەبانی لەنامەیەکدا کەلە ٥ / ١٠ / ١٩٥٢ لە پەکین ڕا ئاراستەی بارزانی کردوە، چۆن بارزانی دەناسێنێ :
« الى الرفيق الزعيم الجنرال مصطفى البارزاني » ئەمە لە دەستپێکی نامەکەیدا، با دواین دێڕەکانی بخوێنینەوە « و الى الامام بقياده بطل تحرير كوردستان الجنرال مصطفى البارزاني ». لە نامەیەکی تردا جەلال تاڵەبانی بەم شێوەیە روو لە بارزانی دەکات « ايها الرفيق الزعيم مصطفى البرزاني المبجل » شایانی باسە هەر لەو نامایەی دوایدا باسی رێکخستنەوەی ریزەکانی پارتی دەکات و لیستەی هەڵبژاردنی سەرکردایەتی نوێی پارتی بەناوی « الرفيق مصطفى البارزاني .... رئيسا، دەناسێنێ! ئایا بەڵگەی لەوانە بە هێزتر هەیە کە نەک خەڵکی ساکار، ئەگەر خەڵکانێک هەبن و ساکار بن، بەلکو رۆشنبیران و سیاسەتمەدارانی ئەوێ رۆژێی پارتیش سەرۆکایەتی بارزانیان قبوڵ بووە. جگە لە برایم ئەحمەد کەسی تر لە سەرۆکایەتی بارزانی لاری نەبووە، کە لەگەڵ ئەوەی کاتێ جەلال تاڵەبانیش گەڕایەوە و بڕیارەکانی ئەو سەرۆکەی پێبوو کە لە دورەوە ئامۆژگاری رۆشنبیرانی نیشتمانەکەی دەکرد یەکبگرن، لە دوری سەدان کیلۆمەترەوە بڕیارەکەی بێسێسودوو لەلایەن هەموان جێبەجێ دەکرا، ئایا دوای ئەوەش دەبوو برایم ئەحمەد هەر لەسەر رێبازی خەیاڵپلاوی خۆی لێخوڕێت، تەنیا بۆ دروستکردنی دوو دڵی لە ریزە کانی پارتی، دواتر خلیسکاندنیان ئەوجا رێگەخۆشکردن بۆ بەدەرەوەنانی بارزانی لە پارتی کۆشش بکات. ئەوەتا خۆی دەڵێت: ( لە برادەرانیشم گەیاند کە مەلا مستەفا ئەوەنییە کە ئێمە چاوەڕێی دەکەین).
ئەگەرچی برایم ئەحمەد لە زۆر شوێن و گەلێک بڕیار و هەڵسوکەوتی خۆی بە پەلیتبیرۆ پینەدەکات کە لە بارزانی دور بون و دەنگیان نە گەیوەتە یەک،

یاهەر بە پێویستی نەزانیوە پرسیشی پێبکات و بۆیە چۆن و چی خۆی بە باشی زانیـوە وای کـردووە. کـەچی کـاتێ بارزانی بڕیاردەدا هەمـزە و کۆمەڵەکەی لە بارەگای پارتی بە دەرەوەنێ، کاک برایم لە سەرووی ئەفریقاوە بەپەلە دەگـەڕێتـەوەو، دەڵێ :( بارزانـی مـافی ئەوەی نییـە کـەس لە پارتی دەربکات و لەخۆوە بڕیاربدات!) ئایا کـەس هـەیە بایی سـەری دەرزییـەک لە سیـاسـەرت شـارەزا بێ، نەزانێ ئەم هەڵوێستـەی برایم تەنیا بەئامـانجی ئەوەبوە کەپارتی هەر خۆیەتی و خۆیشی پارتیە، هـەرچی ئەو بیڵێ و بیکات و ئەگـەر سـەرۆکیش دور بێ پرسـیـشی پێنەکرابێ هەر راستـە و هـەرچی سەرۆکیش بیکات و ئەگەر سکرتێریش دوربێ و دەستی پێنەگات ئەوە ناڕەوا و هەڵەیە؟ پێـویستـە پەلیتـبیـرۆ ( لە راسـتیـدا گـروپەکـەی کـاک برایم لەنێوپەلیتبیرۆ) کۆببنـەوە و بڕیاری پێدەرکەن، ئەو لە کاتێکدا دەڵێ : مەلا مستەفا لە هەمزەی قبول نەکردوە پێی بڵێ ( لقد کنت ..... ) ئەدی چۆن دواتر بەخـۆدا رادەپەرمـوێ لە کۆبونەوە بەناوبانگەکەی مـاوەتدا بڵێ : (بـارانیم بە بەیانامەیەک کردە بارزانی، بە بەیانامە یەکیش لێی دەخەم » ئایا بیری ئەوەی نەکردەوە بـارزانی ئەوەی لێ قبـوڵ ناکات؟ راستییـەکەی ئەوەیە بارزانی لە دەرەوە گـەڕابوەوە، دیـارە کـە گـەیشـتـەوە بەسـەر بارێکی نالەباردا کـەوتوە. ریـزەکـانی پـارتی ئەو ریزە پۆلاین و رێکخـسـتنە رێکوپێکە نەبون، بۆیە نـاچاربووە لە رای ئـەم و ئەو رابـگرێت و دوایش بڕیاری خـۆی بدات، هـەر کەسێکی تریش بایە هەروای دەکرد چ سەیریش لەوەدا نییە کە بارزانی هەر زوو خـەسـلـەت و خـۆی برایم ئەحـمـەدی بۆ دەرکـەوتبێ. ئەوەتا هـەر لە سـەرەتاوە بـارزانی هەوڵدەدات پارتی لە برایم بپـارێزی و برایم لە پارتـی دورخـاتەوە. هـەروەک برایم ئەحـمـەد دەڵێ « دەی گـوت لەگـەڵ تۆ کـارم هەڵناسوڕێت » لەوەشدا راستبووە، سیاسەتمەدار کە جارێک هاوڕێیەکەی بە هەڵەدا چوو ئیـدی بتـمـانەی پێی نامێنێ رەنگە دۆسـتـایەتی بکات بەڵام ئەستەمە کاری پارتایەتی لەگەڵدا بکات.

عەبدولکەریم قاسم خۆی سەرکردایەتی ئەو هێزە سەربازییە عیراقییەی دەکرد کە لەدوای روخانی کۆماری دیموکراتی کوردستان بەسـەرۆکایەتی قازی موحەمەد، لە دیوی بەشە لکێندراوی کوردستان بە عیراقەوە سەری لەدوو بـارزانی و هێزی پێشـمـەرگـە نابوو. کێ بەوە باوەڕ دەکـات ئەو عـەبدولکەریمە لەهاتنەوەی بارزانی بێئـاگـابێ؟ نوێتـرین سـەرچاوەی

بەردەستمان * باسەکە وا دەگێڕێتەوە (بارزانـــــی لە تاراوگەوە بروسکەی « پیرۆزبایی بۆ عەبدولکەریم لێدا) و ( حکومەتەکەی عەندولکەریم بانگەشەی هەزاران لەو کـوردە دەر بـەدەرانەی کـرد بگەڕێنەوە)* بـارزانـی بـەڕێگـەی چیکۆسلۆڤاکیا ئەوجا قاهیرە گەیشتەوە بەغدا)* چۆن دەکرێ عـەبدولکەریم لەم کـەینوبەینە ئاگـادار نەبوبێ ( سـەرە ڕای ئەوەی کـە هۆیەکـانی بلاوکردنەوەش باسی ئەو گەڕانەوەیەیان کردووە)؟ ئەگەر بەبێ ئاگاداری ئەو بو بۆچی لە بەغدا پێشوازی بارزانی دەکرد؟ هەر چۆنێ بێ پرسیار زۆرن، بەلام کرۆکی باسەکە لێرەدایە کە برایم ئەحمەد نایەوێ دەگەڵ بارزانی بچێتە لای عـەبدولکەریم ( دیارە برایم ئەحـمـەد لە بەغدا بو پێشـتر عەبدولکەریمی دیوە و وەک سکرتێری پارتی و سـەرۆک دەوڵەت یەکتریان ناسیوە) بەلام کە برایم ڕێگە لەگەڵ بارزانی دا ناگرێت بۆ لای عـەبدولکەریم لەبەر ئەوەی نەبـوە ( کە بارزانی و ئەوانی تر لە دەرەوە هـاتونەوە ) هـەروەک خـۆی دەڵێت، ( بۆیە دەبێت ئەوان بڕۆن) ئەوە چ دەخـلێکی بە سـەر ئەمەوە نییـە، ناشێ سکرتێری پارتێک خـۆی لە کـارێکی وا گـرنگ بدزێتـەوە. ئیبـرایم ئەحـمـەد لە پلەی یەکەمدا: لەو هەلوێستـەیدا مـەبەستی ئەمە بووە لـە عەبدولکەریم بگەیێنێ ئەو بارزانی بەهیچ دانانێ، ئامادەنییە سـەرۆکایەتی بارزانی بەکردەوە لەبەردەم عـەبدولکەریمدا سـاغ کـاتەوە، هەروەهـا لە بارزانیش بگەیێنێ کـە ئەو وەک بارزانی دەچێتـە لای عـەبدولکەریم نـەک وەک سـەرۆکی پارتـی! دیارە بارزانی زۆر چاک لـەو نیـازەی برایم گـەیشـتـوە و ناچار دواتر کـاک برایم بەگـەری کەوتووە.* لێ ئیبرایم ئەحمەد بۆ ئەوەی سەر لە نەوەی نوێ بشێوێنێ، دەڵێ: بارزانی ئەو کەسایەتییەی نەبوو ! بۆی دروستکرا.

یاخـود دەڵێت : بـارازانی خـودا دەزانێ لەوکاتەدا گۆشـفـرۆش بوە! یاخود بە رادەیەک بارزانی بچـوک دەکاتەوە، بەقسـەی ئەو : ناوی لەسەر عـەرزا نەبوە!!

یا دەڵێت: ئەو کاتە ئەو قوڕپە سەرە سواڵیشی دەست نەدەکەوت*.

جارێ با لەوە گەڕێین، مرۆڤێک گەر گۆشتفرۆشیش بێ، سواڵکەریش بێ، گەر خـەڵکی بە سـەرۆکی خـۆیانی دا بینێن هەروەک بەڵگەمـان بۆ ئەو هێنایەوە، ئەوە هـەر سەرۆکە، بایی تۆزقـاڵێک لە پلـەو پایەی کـەم نابێتـەوە، بەلکو ڕەنگە لای هـەژار و چەوساوەکانی گەلەکەی خۆشەویستریش بێ.

بەلام با بپـرسین : ئەگـەر کـەسێک ناوی لە سـەر عـەرزا نەبێ، چۆن وێنەی گەیشتە سەر بەرگی گۆڤاری تایمی ئەمریکی؟؟

خوێنەری هێژا!
من لێرەدا نامەوێ، بە مەلا مستەفادا هەڵبڵێم، یا راست بڵێم، پیاوێکی وا کە بەرادەی ئەفسانەیەک ناوبانگی خۆی هەیە لە توانای مندا نییە مێژووی ژیانی لەو چەند لاپەڕەیەدا تۆمار بکەم، بارزانی و رۆڵی پۆزێتیف و نێگەتیفی لەبزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان کاری لیژنەیەک زانا و ئەکادیمی و مێژوونوس و کتێبخانەیەکی حەفتا ساڵەی کوردی و ئەرشیفێکی بەر فرەوانی بڵاوکراوەکانی جیهانە بەرادیو و رۆژنامە و گۆڤار و فلیمی تۆمارکراوەوە، دیارە ئەوەش لەوزەی تاکەکەسدا نییە، با ئەوەش بڵێم من باسی بارزانی و پارتی دەکەم لەسەردەمی خۆیاندا، بەلامەوە زۆر زۆر جیاوزە لەگەڵ ئەوڕۆی پارتی و سەرۆکایەتی ئەو ڕۆی پارتیدا. من تەنیا دەمەوێ راستییەک بڵێمەوە کە چەند کاتژمێرێک دوای هەرەسەکەی ساڵی ٧٥ لەبەردەم کۆمەڵێک لە برادەرانمدا وتومە، ئەویش ئەمەیە : نەتەوەکانی جیهان لە بەرابەر سەرکردەکانیان و کەسایەتی وەک بارزانی قسەی سوک بەبانادەن، گەر زۆر زۆر پێی لێهەڵبڕن هەر ئەوەندە دەڵێن « تا بەرژەوەندی لەگەڵ شۆڕش بوو تێدا بوو، کە بەرژەوەندی تیادا نەما پشتێتێکرد ».
ڕۆیشتنی بارزانی و بڕینی سنورەدەستکردەکان و پەڕینەوەی لە ئاوی ئاراس، هەواڵێکی کوردستانی بووە و ماڵە و ماڵی کردووە. لەهۆیەکانی بڵاوکردنەوەی جیهانیشدا مایەی بایەخپێدان بووە. جا چۆن دەکرێت ناوی بارزانی لەسەر عەرزیشدا نەبوبێ؟ خەباتی بارزانی لەیەکێتی سۆڤیەتی رەحمەتی خۆی لە خۆیدا لاپەڕەیەکی گەشی خەباتی ئەو سەرکردە قارەمانەیە هەتا گەر گۆشتفرۆشیش بوویێ. هەڵوێستی سەرکردەیەکی گۆشتفرۆشی سواڵکەر کەلەو پەڕی قەلاشی دابێ زۆر لە هی سەرکردەیەکی خاوەن هەموو شت پیرۆزترە، کاتێ دەروازەی ئەو کرێملەی دنیای دەتۆقاند دەگرێت و بەرۆکی سەرکردایەتی سۆڤیەت بەرنادا هەتا تەواوی داخوازییەکانی جێبەجێ نەکەن!
ئا ئەم هەڵوێستە زۆر لە هەڵوێستی ئەوکەسانە پیرۆزتر بو کە لەو ڕۆژگارەدا بەشان و باڵی یەکێتی سۆڤیەت و ڕژێمی ستالینیان هەڵدەگوت.
ئەوجا سەرەڕای هەموو ئەوەش، برایم ئەحمەد دەڵێ : (هەموو لایەک کە سەردانیان دەکرد « مەبەستی سەردانی بارزانییە » وایان حیساب دەکرد، کە ئەو هەموو شتێکە). ئەمەش وادەگەیەنێ کە کاک برایم لەگەڵ ئەوەی دەیزانی کە هەموو لایەنەکان بارزانی بە سەرۆک دادەنێن و ئەو هەموو شتێکە ( لە

راستیدا بارزانی ببوە سیمبولێک و یادگارێکی زیندوی کۆمارە جوانەمەرگەکەی مەهاباد) بۆیەش ئەو خەڵکە وا رویان لێدەنا. تەنیا حیسابی کاک برایم نەبێ لەگەڵ هەمووان جیابوو ئەو بارزانی بە هیچ حیساب نەدەکرد و زەمینەی ئەوەی خۆشدەکرد رۆڵی بارزانی بپوکێنێتەوە. لەگەڵ ئەوەی رویەڕو ئەمریکاییەکان لە سەر زمانی خوالێخۆشبوو کامەران بەدرخان پێیڕادەگەیێن: یا بارزانی یا برایم ئەحمەد بێت. ئەمەش یانی ئەمریکاش وەک هەمولایەنەکانی تر بارزانییان بەکەسی یەکەم و سەرۆکی پارتی و سەرۆکی کورد داناوە و برایمیش بەنوێنەری ئەو قبولدەکەن. بەڵێ سەرۆکایەتی بارزانی شتێک بوو لەلایەن هەمولایەک بڕابوەوە تەنیاو تەنیا لەلای برایم ئەحمەد نەبێ. برایم ئەحمەد لە لاپەڕەی ٦٢دا دەڵێ: (ئەوەی بە منی دەوت خۆی جێبەجێ نەدەکرد، لەسەرەتادا بەمنی وت ئێوە شەڕ لەگەڵ حکومەت مەکەن، منیش شەڕناکەم، کەچی خۆی شەڕی کرد ... ) لە لاپەڕە ٣٢ دا دەڵێت : (شەڕەکە خۆی بەرۆکی پێ گرت، عەبدولکەریم شەڕی پێفرۆشت و هێنایە نێو شەڕەکەوە). ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە بارزانی خاوەنی قسەی خۆی بووە، هەر بە وتەی برایم ئەحمەد خۆی « عەبدولکەریم » شەڕی پێفرۆشتووە، دیارە کە شەڕیش دەرگەی بەکەسێک گرت، بەتایبەتی کەسێکی وەک بارزانی ناشێ دەستەوە سان بوەستێ و بەرگری لەخۆی نەکات. بەلام لەهەموی نەنگتر ئەو قسەیە، کە بەراستی وەک دەڵێن پاکانە لە تاوان پڕ خەوشترە، کاتێ دەڵێت: (ئەو بوردومانە و کەرەیەتییەی کرا، ئەوە مەلا مستەفای هێنایە شەڕەکەوە) ئەمەش مانای وایە بوردمان و کەرایەتی عەبدولکەریم و دەستوپەیوەندەکانی مەلایان هێنایە مەیدانی خەباتی چەکدارییەوە ئەگینا کوردایەتی و کەسایەتی بارزانی دەخلێکی بەسەر ئەوەوە نەبوە، بارزانیش کوردایەتی نەدەکرد، هەتا گەر شەڕیش دەرگەی پێگرتبا ئامادە نەبوو بەرگری لەخۆی بکات!! و پەلیتبیرۆش لەو لاوە خۆی بەو کوردایەتییەوە هەڵنە دەواسی. چ شەرمە شۆڕشی گەلێک ئەنجامی کەرایەتی سەرۆک دەوڵەتێک بێ! کێ بەم بەیتوبالۆرانە باوەڕدەکات؟ نەخێر دژایەتی برایم ئەحمەد نەک هەر تەنیا بەرابەر خودی بارزانی بوە بەلکو دژی هەر کەسی بووە کە بارزانی بەنوێنەر یا دەمراستی خۆی دانابێ، بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە کە برایم پێش و پاش گەڕانەوەی بارزانیش بەهەمان شێوەملی لە بەر ملی هەمزە عەبدولا ناوە!

برایم ئەحـــمـــەد دەڵێ: کـوایە ئەندامـانی پارتی لە هەمـزە رازی نەبوون و رەخنەیان لێی بوو. ئایا ئەمە راستە؟ ئایا تەنیا رەخنە گرتن لە یەکێک بەسە بۆ ئەوەی مرۆڤ لێی هەڵگێڕێت و هەوڵی بەدەرەوە نان و لێخستنی بدات، ئایا هەموودەم رەخنەی کۆمەڵێک لە ئەندامـانی رێکخراوێک راسـتە؟ گەر بە دوا پرسیاران بکەوین پرسیار وەک خۆڵێ یە. بۆیە باشترە بزانین لێکۆڵینەوەی زانسـتی لەو بارەوە چیـمـان پێ دەڵێت : لە ١٩ ی حـوزەیرانی ١٩٤٧ چوار ئەفسـەری کـورد بەدەسـتی رژێمی پاشـایەتی بەداردەکران ... لە سلێـمـانی رێپێوانی نارەزایی دەستیپێکر ..... دەوڵەت هێرشێکی توندی کـردە سـەر پارتە نیشـتمـانییەکان، بەشی پارتی لەو پەلامارە کەم نەبوو جگە لە چوار کەس ئەندامـانی تری نوسینگەی رامیاری هەموویان دەستگیرکران. سـەر لەدوونان پتر پەرەی سەند، پارتی ناچاربوو بنکەی سەرکردایەتی لە بەغداوە بگوێزێتـــەوە بۆ ( ســـتـک )ان و لەوێوە رۆژنـامـــەی رزگـــاری دەربکات، رێکخـسـتنەکـــانی پارتی توشی شلۆقی بوون ... رژێمی پاشــایەتی و داگیـرکارانی بەریتـانیـا توندتر بەردەوامیـان بە پەلامـارەکـەیاندا. لەپایزی ١٩٥٠دا هەمزەعەبدوڵاش دەستگیرکرا، رۆژنامەی رزگاری وەستا، ئەندامانی دی هیچیان لەدەستنەدەهات بیکەن، دوو بەرەکی لەسـەر هەڵدان دابو، سالح رشدی و موسـتەفـا کەریم دەستیـان بەسـەر چاپخانەکەی پارتی داگرت، حزبێکی نوێیان پێکهێنا ... دژی هەمزە ئازادبوونی ئەویان قۆزتەوە و تومەتی بەکـرێگیـراویان دایە پاڵ و بە پیـاوی ئینگلیـز ناویان زڕاند « بەڵام هەمـزە کـەپارێزە بو، مـرۆڤـێکی زیرەک و لێـهـاتوبو و هەرگـیـز هیـچی بۆ دادگـا هەڵنەوەراند هەتا کــە سکرتێـــری پارتیش بو زۆر بەوریای کــاری دەکــرد بەشێوەیەکی نەهێنی، تەنیا نوسینەکانیشی بەناوی خۆی بڵاونەدەکردەوە. لەگەڵ ئەوەش سکرتێرایەتی پارتی روبەڕوی ئەو کرایەوە ..... هەڵاتنی هەمزە لەدەست پیـاوەکانی میـری لە زاخـۆ ( هەڵبـەتە دەیان ویست بیـدەنەوەدەست رژێمی تورکیا، کە بێگومـان لە کوشتنی ئاویان نەدەخواردەوە) و گەڕانەوەی بۆ سلێمانی بوە هۆی ئەوەی پتر لێی لە قاودەن و یەکسەر لیژنەی مەرکەزی بڕیاری دانیشتنیان دەرکرد* ل ٨٩، ٩٩، ١٠٠، ١٠١، ١٠٢

هیچ قـســەی لەســەر نیـیـە ئەگـەر لەو رۆژانە ریزەکـانی پارتی لە هەمـزە کۆڵنەدەرتری تێدابا، رۆژنـامـەکەی نەدەوەستا و برووبیانوی کەمتەرخـەمی و کالکایەتی کردن بـۆ هەمـزەی سـەرلەدوونراو، گیـراو، دەستـبەسـەرکراو ...

ڕێکنەدەخـــرا * لەوەشـدا برایم ئەحـمـەد دەسـتی سـەرەکی هەبوو چونکێ بەنەمانی هەمزە ( نوێنەرودەمڕاستی بارزانی) ڕێگەی بۆ دەکرایەوە بکەوێتە وێزەی سەرۆکی پەنابەر و دوورەوڵاتی پارتی ( مستەفا بارزانی).
ئەگـەرچی برایم بە مـەرامی خـۆی نە گـەیشت و کـاتی تاڵەبانی گـەڕایەوە ڕاسپاردەکەی سـەرۆکی پێبوو « نابێ بەچاوی تاوانبار بڕوانە هەمزە، بەڵکو دەبێ وەک نیـشـتـمـانپـەروەرێک لێی بڕوانن، بیگێڕنەوە ڕیزەکانـی پارتی ».
سـەرەڕای ئەوەش کـە برایم ئەحـمـەد هـەرگـیـز بە سـەرۆکی پارتی هەڵنەبژێردراوە، بەڵام لەوێ ڕۆژێوە ئەو خـۆی بەسـەرۆک داناوەو لەو بارنە بە تاڵە دەسورێتەوەو خەڵکێکی زۆریشی ڕاپێچی ئەو گێژاوە کردووە و بۆتە هۆی نانەوەی دوبەرەکی لەریزەکانـی هاووڵاتیانی کوردستاندا نەک تەنیا لە باشـور بەلکو لەسـەرتاسـەری کـوردستـان و هەتا ئەم پەتایە لە ریزەکـانی پەنابەرانی کوردیش گەرای خستووە. ئەم قسەیەم بێبەڵگە نیە، ئەوەتا دوای ئەوەی بەرەکەی پارتی بەڕابەرایەتی برایم ئەحمەد و سەرۆکایەتی تاڵەبانی لە ساڵی ٦٤ وە بەربەرەکانێی بارزانیان کرد، دوای ئەوەی بارزانیش ماڵئاوایی لە جیهانی فانی کرد، فەرموون گوێ بگرن و بزانن لەکۆبونەوەکەی یەکێتی و لایەنگرانی یەکێتی لەندەن ( ڕۆژی ٥ /٦/ ١٩٩٥) نەوشیروان مستەفا چی دەڵێ: (لە بەرەبەری کۆتای هاتنی کۆبونەوەکە نەوشیروان مستەفا باسی ئەو دەکات چۆن مەسعود بارزانی بەدوای دا ناردووە تاچەند پرسیارێکی لێبکات، دیارە پرسـیـارەکـانی مـەسـعـود بارزانـی بەنیـازی خـۆشکردنی زەمـینەی هاوکاری و لەیەکدی نزیکبوونەوەی پارتی و یەکێتییە، هەروەک لە قسەکانی نەوشیروان را دیارە/ نوسەر) وتم لە سەر هیچ ( لێرەوە قسەی نەوشیروانە) موختەلیف نین، جەنابت و مام جەلال موختەلیفن، تۆ بە مام جەلال دەڵێی جاشی شەستوشەشەو چۆن سەری بۆ دادەنوێنم، ئەویش دەڵێ من سەرم بۆ باوکی ..... مەلا مستەفا دانەنواند مەسعود خۆی چییە تاسەری بۆ دانەوێنم، خلافەکە لەوێوە دەستپێدەکات):
ئافەرین، سەد ئافەرین! برادەرێکمان قسەیەک دەکات وێچواندنێکە بەڵام زۆر لە جـێـیـە. ئەو دەڵێ ( برایم کـورەی برای کـوژەیە، جـەلال ئاگـرەکـەیەتی، نەوشیروان یش هەمبانەکەی، هێندێ جاریش دەی کاتە کاڵتە و دەڵێ: بابە با ئاگردان و پشکۆ و دوکەڵەکەبێ .... با ئاسن نەبێ و گوشتی کورد بێ کرنگ ئەوە سـوربێتـەوە) بەڵێ! دیارە نەوشـیـروان مـسـتـەفـا بەگـوێی خـۆی

لێخۆشبونەکەی بارزانی دوای بەیانی ئازاری حەفتای گوێ لێ نەبووە، داوەتی ئەو کۆبونەوەیەش نەکراوە کە تێیدا باڵە کەی برایم دوای ئەوەی لە لایەن میرییەوە چەک کران. چونەوە لای بارزانی و کۆنگرەیان بەست و ناوی خۆیان گۆڕی و خۆیان هەڵوەشاندەوە .... تێکەڵ پارتی بونەوە، دیارە بە چاوی خۆی هەموو ئەوەی نەدیوە چونکێ دوور نییە داوەتی ئەم کۆڕ و کۆبونەوە و بڕیارانە نەکرابێ، بۆیە دەڵێین هیچ ناحەقی ناگرین و ئەو باسانەی هەموو لاوەکی خوێندۆتەوە و یا بەر گوێی کەوتوون. خوا راستانە بارزانی هەڵوێستێکی وای نواند کە باڵەکەی برایم هەست بەوە نەکەن کە هاتنەوەیان سەردانەواندنە، نەوەکا لە بەر چاوی دوژمن ( بەعس ) وەک نەتەوەیەک بەسوک تەمشا بکرێین، بەپێچەوانەوە ئەو گەلێک بەسەربەرزی رێزی لێنان و لەریزی پارتی وەریگرتنەوە!! کەچی نەوشیروان مستەفا نەک هەر راستی ئەو مێژووە فەرامۆش دەکات و دەیەوێ سەر لەو نەوە نوێیە بشێوێنێ ( ئەوانەی دوای قسەکەی قا قا پێدەکەنن و چەپڵەلێدەدەن ) بەلکو فو بە ئاگرەکەدا دەکات و کورەکە دەدەفێ! لە پای چی و بۆ کێ؟؟

ئایا تێکەڵ بوونەوە و یەکگرتنەوەو لە یەکدی نزیکبوونەوەو پتەوکردنی ریزەکانی جەماوەری کوردو لەیەکتری خۆش بوون و دلفراوانی و چاوپۆشی لە هەڵەی رابردوو و کردنەوەی لاپەڕەی نوێ ..... هتد، لە نێوان کورد خۆیدا، سەردانەواندنە؟! ئابڕوچونە؟ بێغیرەتییە؟ کەمایەتییە؟!

بەلام ئەمەیە راستی، بەلای باڵەکەی برایم ئەحمەد و ئەو یەکێتی نیشتمانیەی کە درێژبوونەوە و میراتگری فەلسەفەکەی کاک برایمە، هەڵوێستی وا سەردانەواندنە ئەویش هەر لە سەرەتاوە هەمان هەڵوێستی لەبەرابەر بارزانی گرتەبەر تا سەری بە شەڕیبراکوژی دا کرد، ئەوەتا ئیمڕۆش ئەوانەی رێبازەکەی دەکوتنەوە بەهەمان شێوە بیردەکەنەوە!! من یەک تاکە پرسیار لەوانە دەکەم : ئایا سەرۆکێکی وەک بارزانیمان ـ هەبوایە باشتربوو، یاخود سی ساڵی شەڕی براکوژی؟ بەخۆدا رادەپەرموم بڵێم ئەم پرسیارەم تەنیا ئاراستەی نەوشیروان مستەفا نییە بەلکو ئاراستەی تەواوی رۆشنبیرانی کوردە. ئەو قسەیەی نەوشیروانیش تەنیا ئەو نوکتە هیچوپوچەم دێنێتەوە یاد کە دەڵێت گوایە سەدام کیمی وتویەتی : ئۆتۆنۆمیم بەباوکی ( مەلا مستەفا ) نەدا، چۆن بە کوڕەکەی ( مەسعود ) دەدەم !! پێدەچێ ئەم قسە هی خودی سەدام بێ چونکێ قسەی مرۆڤێکی لە بەرابەر کورد دا بەزیوە!

بەڵام گەر یەکێتی بە هەمان بیرورووانگەی کۆنییەوە مامەڵەی رووداوەکانی نەکردبا ئەنجامی دەنگدانەکەی پەسەند بکردابا و هێندە پێی لە سەر فیفتیفیفتی دا نەگرتبا، باوەڕم وایە بە بەزین لەسەر یەکێتی نەدەژمێردرا بەلکو بە پێچەوانەوە جگە لەوەی دەبووە بەردی بناغەی دیموکراتییەت ئەوا بنچینەی ئاشتییەکی پتەویشی لە باشوری کوردستان دەخەملاند، برینی قولی سی ساڵەی سارێژدەکرد، کە بێگومان ئەمە بەگشتی بەقازانجی تەواوی بزاڤی رزگاریخوازی کوردستان دەکەوتەوە. برایم ئەحمەد چامەیەکی شیعری هەیە، لەوچامەدا تا ئەو رادەیە بۆی دەڕوات کە رزگاربوونی کورد نابێ ئەگەر قەفی ئاگر منالی نێو لانکیش لرف نەدا، من کە چامەکەم دێتەوە بیر نازانم بۆچی یەکسەر دۆزەخم بە بیردێتەوە. لەخۆم دەپرسم باشە کاک برایم ئەم دۆزەخە چییە داتخستووە؟ بەڵام سەیرە ئەو دۆزەخەی کە بەبۆچوونی چامەکەی برایم ئەحمەد رێگەی شۆڕشی پێدا دەڕوات و دەگاتە سەرکەوتن، نابێ یەک پریشکی بەر کاک برایم کەوێت! ئەوەتا کاک برایم دەڵێت : ... پاشان مەلا مستەفا دەیکوشتین، ئەگەر ئەو نەمکوژێ، من دەچمەوە لەشارەکەی خۆم دادەنیشم، بۆ لە بەغدا دادەنیشم؟!!
لێرەدا با ئەو بەلاوە نێین کە دانیشتن لە بەغدا شتێکە و ئەوەی باڵەکەی کاک برایم شتێکی تر. لێ بۆمان هەیە بڵێین کەواتە برایم ئەحمەد بۆ کەوچێک خوێن*، کوردستانی بەجێهێشت و بۆ پاراستنی گیانی خۆی روی لە بەغدا کرد! بە پێویستیشی نازانم بچمە نێو دیرۆکی ئەو هاتوپاتەی لەنێوان پەلیتبیرۆ و حکومەتی عیرادا بوو، بەڵام ئایا برایم ئەحمەد نەیدەتوانی ئەو ژیانە کە گوایە بە پەنابردنەبەر بەغداو دەوڵەتێکی داگیرکاری کوردستان، لە هەندەراندا و لە ژێر باڵی دەوڵەتێکی دیموکراتی بۆ خۆی مسۆگەر بکات؟ بەڵێ بێگومان زۆریش بەئاسانی، بەڵام برایم ئەحمەد دیسا لەو باوەڕەوە دا بوو کە ئەمجارەیان بەپاڵپشتی تۆپ و فڕۆکەی داگیرکاری کوردستان بارزانی دەفەوتێنێ، ئەو هەڵەیەی دووبارەکردەوە کە دەیان جار لە مێژوودا دووبارەبۆتەوە، هەڵەیەک رێگەی خۆشکرد بۆ نەوەیەک ملی رێگەی چەوت و سەرلێشێوان و بزرکردنی دۆست و دوژمن بکوتێتەوە.
ئەگەر خوێنەر سەرنجێکی وەڵامەکانی برایم ئەحمەد بدات لە ئاست پرسیارەکاندا، یەکسەر ئەوەی بۆ دەردەکەوێ کە برایم ئەحمەد بەهیچ شێوەیەک راستەو خۆ وەڵامی پرسیارەکان نەداتەوە، بەلکو زۆربەی

وەلامەکانی بە پێشەکییەک دەستپێدەکات و دوێنەرەکەی دێنێ و دەبات. زۆر جار ناچاری دەکات قسەی پێببڕێت و پرسیارەکە دوبارە بکاتەوە، یا خود بەبیری بێنێتەوە کە ئەو مەبەستی لەوە نییە کە ئەم باسی دەکات، بەلکو مەبەستی پرسیارەکەی ئەمە و ئەوەیە. بۆ وەلامدانەوەی ئەو پرسیارەش : ئایا پەیوەندی نێوان ئێران و پارتی، پێش پەیوەندی نێوان ئێران و بارزانییە، دیسا برایم ئەحمەد دەکەوێتە هەمان چاوڕاو و هێنان و بردن، بەشێوەیەک پەلیتبیرۆ و پەلیتبیرۆی پارتی و فلان و فیساری تێکەلدەکات کە سەر لە مرۆڤ بشێوێنێ. با چاو لەوەش بپۆشین کە شا خۆی وتویەتی ( مەلا هیچی لەمن داوا نەکردووە ـ ل ٥٨) لەگەل ئەوەشدا بۆ هەرچی مەبەستێکی بێ و لەپێناو هەر چی دابێ، ئەوە هیچ قسەی لەسەر نییە کە برایم و هاوەلەکانی دەستپێکار و یەکەم گروپن کە پەیوەندیان بە ئێرانەوە کردبێ، جا ئەم پەیوەندییە سەری گرتبێ یا نا، لە ئاست پرسیارەکەدا، ئەوە شتێکی ترە، خوێنەر دەتوانێ بگەڕێتەوە سەرچاوەکانی مێژووی ئەم چەند دەسالەی دوایی کە لە گشتیان دا دوپاتە لەسەر ئەوە دەکرێتەوە کە بەرەکەی برایم پێش بارزانی پەیوەندیان بە ئێرانەوە کردووە.

دیارە هەروەک خۆی دەلێ ئێرانییەکان رازی نەبوون لەئاستێکی بەرزدا لەگەلیان دانیشن.

لە درێژەی وەلامەکەشدا دیسا برایم ئەحمەد ئەوە ئاشکرا دەکات کە متمانەی بە بارزانی نەبووە و تاکە کەسێک بووە لەو رۆژگارەی شۆڕشی کوردستان بارزانی بەهیچ داناوە و پرسی پێنەکردووە، ئەو خۆی، لە لاپەڕە ٣٦ دا، کە باس لە چۆنییەتی سەفەرەکەی دەکات، دەلێ: من ئیجازەم وەرگرتبوو کە دەتوانم بەسەربەستی بجولێمەوەو هەرچی دەمەکەم، بیکەم ...... دواتر دەلێ :
بێگومان لە مەلا نا، لەو جێیانەی لەو کاتەدا بەلای منەوە جێی باوەڕبوون!!
ئەمەش مانای وایە، مەلا جێگەی باوەڕ نییە و سۆڤیەت جێگەی باوەڕە!
بێگومان زۆر ئەستەمە ئەم قسەیە سوربکرێتەوە، بەلام دەتوانین وای لێ... ینەوە کە برایم ئەحمەد لابەلا و بێپرسی بارزانی پەیوەندی بە سۆڤەتەوە کردووە، لە کاتێکدا برایم ئەحمەد سۆڤیەتی هەر لە دورەو و لەسەر لاپەڕی کتێبان دەناسی و وەک بارزانی تاقیکردنەوەی راستەوخۆی لەگەل سۆڤیەت نەبوو، جگە لەمەی ئەوە بەپێچەوانەی داوای بارزانییە کە هەر لەسەرەتاوە داوای لە برایم کردووە لای ئەمریکای بۆ بگرێت. چونکێ بە رای بارزانی لای

سۆڤیەتی مسۆگەر بووە، ئەمەش تا رادەیەک راستە، لە بەر ئەوەی سۆڤیەت هەر ئەو سۆڤیەتە بوو کە بەبەرچاوی عەبدولکەریمەوە فرۆکەی تایبەتی بەدوای بارزانی دا نارد و داوەتی جەژنەکانی ئەکتۆبەری کرد، ئەگەر ئەم وتەی برایم ئەحمەد راست بێ و پەیوەندی بەسۆڤیەتەوە کردبێ ( هەرچەندە باسی ئەوە ناکات ئایا لە بڕیاری ئەم پەیوەندییەدەنگدانی پەلیتبیرۆی وەدەستهێناوە یا نا ـ چونکێ دەڵێ ئەوانەی لای خۆم جێی باوەڕبوون) ئەوە تەنیا بە مەبەستی ئەوەبووە رووی بارزانی لەلای سۆڤیەت تاڵ بکات. بارزانی زۆر ژیر بووە کە هەر لە سەرەتاوە وەک برایم ئەحمەد دەڵێت : پێ وتم لای ئەمریکام بۆ بگرە، بەلام دوای ئەوەی پێڕەوانەدیتم!
دیارە بارزانی زۆر چاک و زوو بەزوو شارەزای برایم ئەحمەد بووە. بەتایبەتی هەروەک کاک برایم دەڵێ: من نزیکەی مانگێک لە وێ ماوەمەوە، ئەدی بۆ نەیدیتم ( مەبەستی لە شایە) ؟ دەزانی بۆ؟ بۆ ئەوەی جارێکی دیکەش بتوانێ، بە مەلامستەفا بڵێ، دۆستەکەت کۆمۆنیستە، جارێکی دیکەش دووکەرتمان بکا، بەلام بەداخەوە، من درەنگ هەستم بەوەکرد . مرۆڤی سایسەتمەند ئەو مرۆڤەیە کە یەکسەر لە فیتی دوژمن دەگات، مرۆڤێک سەر لە سیاسەتی شا دەرنەکات چۆن دەشێ سەرلەسیاسەتی ئەمریکا دەربکات؟ کە واتە جارێکی تریش بارزانی راستیکردوە کە وتویەتی کارم لەگەڵ تۆ ناسوڕێ. ئێستە پرسیاری سەرەکی ئەوەی کە کاک برایم ئەوەتا بەدەمی خۆی دەڵێ (بەداخەوە من درەنگ هەستم بەوەکرد) بەلام لەگەڵ ئەوەشدا زیاتر و بەگوڕتر و بەتاوتر خزیە نێو پلان و دەسیسەی ئێران و عیراق. لەوەش خەراپتر ئەم رێبازەی کاک برایم تاوەکو ئیمڕۆ، بەلکو بە شێوەیەکی رێکخراوتریش لە جاران بەردەوامە و درێژەدەکێشێ.
لە لاپەڕە ١٩ دا برایم ئەحمەد، دەڵێت: بڕوایەکی تەواوم بە کوردستانییەتەکەی ژ.ک. هەبوو. کەچی لە لاپەڕەی ٧٨ دا دەڵێ: هەموو هێزەکانی هەر چوار پارچەکەی کوردستان یەکبگرن بەشەڕ دەرەقەتی یەکی لە دوژمنەکانمان نایەن ..... جادەبێ مەرامی کاک برایم چیبێ لەوە دا ژ. ک. و بەرنامە کوردستانییەکەی بە دڵ بێ لە کاتێکدا گەر هەموو هێزی کوردستانیش راستبێتەوە هیچی پێنەکرێت؟ ئەدی بۆمان نیە بپرسین: رێکخراوێکی کوردستانی بۆ چییە و بەکەڵکی چیدێ ئەگەر هەموو کوردستانیش راستبێتەوە هیچی پێ نەکرێت؟

ئالێرەوە باسەکەمان دەگاتە لاباسێکی زۆر گرنگ کە پەیوەندی بە خەباتی ئیمڕۆی کوردستاوە هەیە. خەباتی کوردستانی و خەباتی نیشتمانی کوردستان،
دەمێکە یەکێتی نیشتمانی و بە تایبەتی ڕێبەرە کۆنەکانی ئەم ڕێبازە بەڕژدی کەوتونەتە جموجۆڵ بۆ هەڵوەشاندنەوەی هەموو بیروباوەڕێکی بە کوردستانی بوون، لەو بوارەدا کارێکی زۆریان کردووە بۆ پەشیمانکردنەوەی ئەو ڕێکخراوانەی بیرو بۆچونی کوردستانیان هەبووە و هەیە، ئەوتا لێرەشدا برایم ئەحمەد مژدەی ئەوەمان دەداتێ، دەڵێ: ئەوڕۆ پ ک ک ئەم کەمورییەی نەهێشتۆتەوە و دەڵێن، ئامادەین بەبێ سەربەخۆیی و دامەزراندنی دەوڵەتی کوردستان بیبڕینەوە، کێشەی کورد بەشێوەیەکی ئاشتیخوازانە چارەسەر بکەین. وەک ئەوەی دەستهەڵگرتن لە دروشمی سەربەخۆیی و دامەزراندنی دەوڵەتی کوردستان ڕێگەی چارەسەری ئاشتیانەی کێشەی کوردستان فەراهەم بکات. ئەم مژدەی برایم ئەحمەد دیسان دژی ئەو بۆچونەی خۆیەتی کە دەڵێ: دەبێ لەگەڵ دوژمندا داوای پتر بکەیت تا کەمێکت دەستکەوێ.
لێرەدا بەپێویستی دەزانم ئەوە ڕونکەمەوە کە ئەو پلان و بۆچونانەی برایم ئەحمەد مژدەی پاشەکشەی پ ک ک لە دروشمی سەربەخۆیی و دامەزراندنی دەوڵەت و ئەستاندنەوەی مافی نوێنەرایەتی کردنی.هاولاتیانی کوردستان، هەروا پێشنیار و پلانی چاکەکاری نین بەسەر زمانی برایم ئەحمەد داهاتبن. نەخێر برایم ئەحمەد ڕێگە بۆ ئەو خۆشدەکات لێرەشدا ڕێبازەکەی خۆی بەسەر بزوتنەوەی هاوولاتیانی کوردستاندا بسەپێنێ. ئەمە زۆر ڕونە ئیمڕۆ گەر ڕێکخراوێکی وا بێتە کایەوە لەهەندەران ئەوە هاوولاتیانی کوردی باکور و بە تایبەتی پارتەکەی عەبدولائۆجەلال دەستێکی بالای تێدا دەبێ نەک هەر ئەوە ڕەنگە ئەو ڕێکخراوە ژێر رکێفیش بکات، لەو بوارەوە هەوڵی زۆر دەدات، دیارە یەکێتی نیشتمانی یا ڕاستر ڕێبازە کەی برایم ئەحمەد لەو بارەوە ناتوانێ قەرەی لە قەرەی بدات، جگە لەوەش ئەوە دیسا مەترسی ئەوەی لێدەکەوێتەوە ئەو هەوڵوتەقەلایەی لەلایەن کۆنگرەی نیشتمانی کوردستانەوە دەدرێت سەری بەئاکامێک بگات. کە ئەوەش دژی ڕێبازی برایم ئەحمەدە، دەبێتە هۆی پوچاندنەوەی ڕێبازەکەی لە کوردستان، بێگومان ئەویش ئەمەی بە دڵ نیە، بۆیە چەپڵە بۆ هەر پارتێکی کوردستان لێدەدا کە دەست لە دروشمی سەربەخۆیی کوردستان و دەوڵەت هەڵبگرێت! چونکێ جاڕدانی ئەم

دروشمە لە بەرژەوەندی کوردە و دژی بەرژەوەندی ڕێبازەکەی برایم ئەحمەدە.
هێشتاش ڕێبازەکەی ئەو سەرتاپای کوردستانی نەگرتۆتەوە و هیواداریین بە پاشگەزبوونەوە و تێوە گلانی پ ک ک لە جەنگی نێوخۆیی و شەڕی لابەلا ئەو ڕێبازەی کاک برایم هەنگاوێکی نوێی بەرەو پاشەوەبەبزاڤی ڕزگاریخوازی کوردستانییەوە بنێ لەباکور هەروەک لە باشوور بەچاکی ئەم کارەی ئەنجامداوە.
من دڵسۆزانە، بەتایبەتیش ڕودەکەمە ئەندامان و دۆستان و لایەنگرانی کۆمیتەی ئاشتی و پشگیری نیشتمانی کوردستان و کۆمیتەی ئامادەکردنی کۆنگرەی نیشتمانی کوردستان کە لەوە زیاتر چاوەڕێی ئەم لاو ئەولا نەکەن و چیتر ڕۆژی کۆنگرە دوانەخەن چونکێ زیانێکی گەورە لە هاووڵاتیانی کوردستان دەکەوێ و هەموو ئەو هەوڵ و تەقەلایەی تا ئێستە دراوە بەفیڕۆ دەچێ.
ڕێگەی خەباتی کوردستان یەک ڕێگەیەو بەس، چ لە کوردستان، چ لە دەرەوەی کوردستان، ئەوەی لە کوردستان بە گیانی کوردستانییەت خەبات نەکات، لە هەندەرانیش هەر نایکات، پێچەوانەی ئەمەش ئەوەی لە هەندەران خەباتی کوردستانی نەکات لە کوردستانیش هەر نایکات. جا تاوەکو ئەم پەتایەی برایم ئەحمەد دەیەوێ بڵاوی بکاتەوە نەبێتە پەتای سەدەی بیستویەکی کوردستان پێویستە بەزوترین کات بۆ پێکهێنانی کۆنگرە دەستپێشکاری بکەن.
ئێستە با لەوەش لادەیەن کە بەبێ پەردە برایم بەرگری لە یەکێتی نیشتمانی و موفاوەزاتەکەی یەکێتی و هەڵوێسوتی یەکێتی دەکات، لاپەڕەیەکی نوێی ئەم باسە بکەینەوە. واز لەوەش بێنین کە برایم ئەحمەد دژایەتی بارزانی کردوە، وای دابنێین کە شتی وا هەر نەش بووەو ڕوی نەداوە، سەرنجێکی ئەوەبدەین بزانین کەڵە پیاوێکی ئەم سەدەیەی کوردستانی هێشتۆتەوە، بەگژیدا نەچووبێ؟ پیرەمێرد، کامەران بەدرخان، مەسعود موحەمەد و بە ناڕاستەوخۆش مامۆستا جەمال نەبەز ..... کە کەڵە پیاوی ئەم سەدە بوون و هەن، بزانن برایم ئەحمەد چۆن بەگژیاندا دێتەوە، ئەوەی پیرەمێرد دیارە لەسەر چییەو هێندە ڕونکردنەوەی پێناوێ. ئەوە نەبێ پیرەمێرد ڕاستگۆ بووە برایمیش ڕاستی بۆ قوت ناچێت. کامەران بەدرخانیش : بە قسەی کاک برایم دەستی گێرەشێوێنی هەبوو. شایانی باسە کە مامۆستا جەمال نەبەز

لەلاپەڕە ٩٣ و ٩٤ و ٩٥ ی ناميلكەی ( بيری زانسيانە يا بالۆرەی ترم پرم پف ) دا بەدرێژی باسی ئەو سەفەرەی كامەران بەدرخان دەكات و قسەكانی لەزاری كامەران بەدرخان خۆی دەگێڕێتەوە، هەرلەوێدا دەڵێ (چونی ئەمجارەشی بەو ڕێیەدا بە ڕەزامەندی بارزانی بوو) مامۆستا جەمال نەبەز، دەڵێ: كە گەڕایەوە ئەوروپا بە خۆمی وت لەسەر داوای بارزانی سەردانی شای كردووە. كەچی كاك برايم سەفەرەكەی بە جۆرێكی تر لێ بەداوێوە دەكات و كامەران بەدرخان بەگیرەشێوێن و بەرژەوەندپەرست نێوزەددەكات. دوریش نييە لێرەدا ئەويش وەك دەڵێ پيرەمێرد زۆر وەستابوو لە بەكارهێنانی وشە، ئەويش ڕەنجی بە خەساردابێت، وەك ئەوەی ناڕاستەوخۆ بەخوێنەر بڵێت، مامۆستا جەمال نەبەز ئەم قسانەی هەڵبەستوون، چونكێ جێگەی گومانە كە برايم ئەحمەد ناميلكەكەی مامۆستا جەمال نەبەزی نەخوێندبێتەوە. ئەوەی لە هەمووێتر دەمەتەقێ هەڵدەگرێ كێشە كەی مەسعود موعەمەدە، هەر چەندە ئەويش خۆی زيندوە و پێويستی بەوەنييەمن لەسەری بكەمەوە. بۆيە تەنيا ئەو لايەنە ڕاميارييە باسدەكەم كەنەختێ بيروبۆچونی ئاوەژووی برايم ئەحمەدمان بۆ ڕون دەكاتەوە، ئەو دەڵێ: من وەكو سكرتێری پارتی پێشنيارم كرد، ئەم جارە نابی ئێمە لە كۆيە، نابێ كاكەزياد بێ، چونكە خەڵكی دەڵێن، كاكەزياد بەهۆی خێڵەكييەوە دەردەچێ، پارتی دەستی لەم كارەدا نييە، كاكەزياد هەر كاتێ خۆی هەڵبژێرێت دەردەچێ، ئێمەبا پياوی هەڵبژێرين، كە خۆی دەسەڵاتی نەبێ.
خوێنەوارانی بەڕێز! ئێوە بڵێن ئەو بێدەسەڵاتە كێ بێ باشە؟ مەسعود محەمەد !! ئا ئەمە هەموو تێگەيشتنی برايم ئەحمەد بووە لەو ڕۆژگارەدا، بە ڕاستی ئەوەی لەو ڕۆژگارەدا سياسەتی كردبێ و مەسعود محەمەدی بە بێدەسەلات زانيبێ، ئەوە نەك هەر فڕی بەسەر سياسەتەوە نەبووە و نييە، بەلكو ريشيشی تياچووە. چونكێ مەسعود محەمەد لە ڕۆژگاری ئەوێ ڕۆژێ نەك هەر دەسەلاتێكی مينۆكی ( مەعنەوی ) خۆی و باوكی ( مەلای گەورە ) پشگيريان كردووە بەلكو كەسايەتييەكی وەك كاكەزياديش بەولای پشگيرييەوە بۆی تێكۆشاوە، ئەوەی برايم ئەحمەد بە بێدەسەلاتی زانيوە، نەك هەر بێدەسەلات نەبووە بەلكو كۆمەڵێك دەسەلاتی تريشی ( ماكی و مينۆكی ـ مادی و مەعنەوی ) لە دواوەوە بووە. بەلام دیارە دەسەلات لای برايم ئەحمەد هەر چەك و دەستی چەكهەڵگرە، بۆيەش كە نەيتوانی دەسەلاتی مينۆكی

بارزانی بروخێنێ لە کۆتاییدا بەچەک بەگژی داچوو. بەڵام لەبەر ئەوەی برایم ئەحمەد هێشتاش لەوە نەگەیشتووە دەسەڵاتی مینۆکی زۆرجار کاری وا دەکات بەدەسەڵاتی ماکی ناکرێت و رەنگە زۆرجار ببێتە بنچینەی دەسەڵاتە ماکییەکە، ئەوا لەوێ رۆژێ پێشنیارەکەی لە سەدا سەد هەڵە بووە و لەگەڵ ناوەرۆکی مەبەست نەگونجاوە، کە تا ئیمرۆش هەستی بەبیروبۆچونی ناوەڕووی خۆی نەکردوە ئەوە ماڵیئاوا، جا گەر برایم ئەحمەد هەر هێندە سەرەدەری لە ناسینی کەسایەتی و باری رامیاری ناوچەیەکی وەک کۆیە کردبێت کە بەبەراورد لەگەڵ باشوری کوردستان ناوچەیەکی سنووردار و دیاریکراوە، دەبێ چەندە سەرەدەری لە خەباتی سیاسی کردبێ لەسەر ئاستی کوردستان و ناوچەکە و جیهان؟؟ کە تۆ سەردەر لە سیاسەتی ناوچەیەکی چەندکیلۆمەتری و چەندسەد هەزار کەسی نەکەیت، چۆن دەتوانی سەردەر لەسیاسەتی وڵاتێکدا بکەیت، بە چ پێوەرێک دەتوانی سیاسەتی پڕ لە قۆرت و فڕوفێڵی جیهان تێبگەیت؟ ئەمەش بەرۆڵی خۆی دەبێتە بەڵگەیەکی پتەو کە بڵێین: زۆر شت هەن تاوەکو ئیمڕۆ برایم ئەحمەد عەقڵی پێیان نەشکاوە. مرۆڤێکیش کە عەقڵی بەشتان نەشکێ هەرگیز چ پەندێک لەتاقیکردنەوەی ژیان وەرناگرێت! بەداخەوە! کەواتەبرایم ئەحمەد، هەروەک لە سیاسەتی ناوچەیەکی بچوکی کوردستان هەر هێندە تێگەیشتووە، لەسیاسەتی شای ئێرانیش هەر ئەوەندە تێگەیوە کە خۆی دانییاناوە حەقی بارزانی بووە، پێی بڵێت کارم لەگەڵ تۆ بۆ هەڵناسورێت، کە تۆ لە تاقیکردنەوەی بچوک و بچوکتر دەرنەچیت دیارە لە هی گەورە و گەورەتر هەر دەرناچی.

لە کۆتایدا تکام لە کاک برایم ئەوەیە لە بیرەوەرییەکانیدا وەک خۆی دەڵێ (هەموو راستیش بڵێ، رەنگە گێرەشێوێنی تێدابێ .... ) هیچ گوێ بەوە نەدا و هەموو راستیەکانیش بڵێ، چونکێ وتنی راستی تاکەسەروەرییە کە مرۆڤ لەدوای خۆیدا بەجێی بێڵێ، ئێمەی نەوەی نوێش پێش هەموو شتێک پێویستمان بەراستییە، هەموو راستی، باوەڕیشمان بەوەهەیە کەراستی نەک هەر نابێتە هۆی گێرەشێوێنی، بەڵکو بەپێچەوانەوە، بنەمایەکی بەهێزی تەبایی و لەیەکتری نزیکبوونەوەی ریزەکانی جەماوەردادەڕێژێت. دوا وشەشەم بۆ خوێنەرانی ئەم باسە ئەوەیە: کە من نەهاتووم لەسەر بارزانی و پارتی بکەمەوە، بارزانی خاوەنی مێژووی خۆیەتی و پارتیش جگە لەدەیان

نوسەر و سەدان و بگرە هەزاران چەکداری هەن و پێویستیان بەلەسەر کردنەوەی من نییە، ئامانجی سەرەکی من ئەوەیە نەختێکی تر ئەو وێنەیە بەرجەستەکەم و بیهێنمە بەرچاوی ئەم نەوە نوێیە کە راستی ئەم شەڕی کورد کورد و سەرچاوەکەی لە کوێوە هەڵدەقوڵێ، چ جۆرە خەسڵەت و خو و کەسایەتییەکە، کە کورد بەردەوام دووچاری ئەم رێگە ئەستەنگ و پڕ لە زیانە دەکات، بۆیە نامەوێ خوێنەر لەگۆشەنیگای کولاندنەوەی برین و رقوکینە لەم نوسینە بڕوانی، بەڵکو پێویستە بیر لەوە بکاتەوە کە بە چ رێگەیەک توانای دەشکێ و زاڵدەبێ لە کۆشتنی ئەو خەسڵەتە خەراپانە و لە دەرونی خۆیدا ریشەکێشیان دەکات.
بەتایبەتی لەرۆژی ئەمڕۆدا کەبزاڤی رزگاریخوازی کوردستان پێویستی بەوەیە ئەم نەوە نوێیە هێڵێکی سور لەنێوان خۆی و ئەو دەردە کوشندەیە بکێشێ تا خەباتەکەی نەبێتە دوبارەکردنەوەی کرچ و کاڵی مێژووی رابردو، ریسەکەی نەبێتەوە خوری.

پەراوێزەکان

* پێنج کاتژمێر لەگەڵ برایم ئەحمەد دا، بریتییە لەچاوپێکەوتنێک کە حوسێن محەمەد عەزیز، لەگەڵ مامۆستا برایم ئەحمەد دا سەرەتا تۆماری کردووە، ئەوجا دوای نوسینە و رێتکخستنی لەدوتوێ نەوەت لاپەڕە دا چاپی کردووە، لەگەڵ ئەوەی پێشەکیشی بۆ نوسیوە بەڵام بیروڕای خۆی لە بەرابەر ئاخاوتنەکەدا دەرنەبڕیوە.
* هـ . ئەکرەم، هەر لەو ژمارەی دلانپاردا تەماشای لاپەڕە ٣٦ بکە.
* غازی دوویە، لە زاری هەولێردا زۆرباوە، ئەو غازەیە کە دوای پاڵاوتن بە پاڵە پەستۆ یەکی زۆر لە بەرمیلێکی بچوکدا ئەماردەکرێت، بۆ سوتاندن بەکار دێت.
(١) بەڵگەی ئەم قسەیەم ئەم هەموو نامەو بانگەوازانەیە کە بەکۆمەڵ و بە تاکە کەسی لە کوردستان و هەندەراندا ئاراستەی سەرانی پارتی و یەکێتی ... کرا و دەکرێت بۆ راگرتنی جەنگی کورد کورد.
* سەرچاوەی پێشو، یا تەواوی ئەو وشانەی بە شێوە تیپێکی جیا لە سەرجەمی نوسینەکە دا چاپکراون لە نامیلکەی نێوبراودا ( پێنج کاتژمێر .... ) وەرگیراون.
* نمونەی کابرای جگەرەکێش، بڕوانە لاپەڕەی ٥٥ ، نامیلکەی ناوبراو.
* دووچاوی ساغ، بڕوانە لاپەڕەی ٨٧ نامیلکەی ناوبراو.
* خۆی شیری هەتا پیری، پەندێکی کوردییە
* دەقی عەرەبی نامەکانی جەلال تاڵەبانی بڕوانە، البارزانی و الحرکە التحرریە الکردیە ٤٥-٥٨ ، مسعود بارزانی، مطبعە خەبات، چاپی یەکەم ١٩٨٧

* نوێترین سەرچاوەی بەردەستمان، بریتیە لە حركە التحرر الوطني الكردستاني في كردستان الجنوبي ٣٩-٦٨ « اراء و معالجات » تێزێکی دکتورایە کە دکتۆر خەلیل جندی ئامادەی کردووە. بڕوانە لاپەڕەکانی ٩٨ تا ١٠٢
* وتەکانی نەوشیروان مستەفا، لە کاسێتێکی تۆمارکراودا وەرگیراون.
* جەمال نەبەز، بیری زانستانە یان لێدانی بالۆرەی ترم پرم پف، سالی ٨٧، بڕوانە لاپەڕەی ٩٣ تا ٩٥ .

## تێبینییەکانی خۆم :

1. ئەم گوتارە، لەم سەرچاوەیەوە وەرگیراوە : ڕێباز محێدین، گۆڤاری دلانپار، ژمارە 1، سالی 1996، لاپەڕەکانی « 28 - 35 - 41 ».
2. وەک لە دواییدا بۆم دەرکەوت، « ڕێباز محێدین » ناوێکی خوازراوە و لە لایەن « ڕەهبەر جەلال »ەوە بلاوکراوەتەوە.
3. لێرەدا، ئەم گوتارەم بلاوکردۆتەوە، بێ ئەوەی، دەسکاریی هەڵەی چاپ، ڕێنووس و شێوازی نووسینەکەیم کردبێ. چونکە، گوتارنووس گوتارەکەی هێندە بە پەلە نووسیوە و بلاوکردۆتەوە، هێندە دڵ پڕ لە داخ بووە، فریای ئەوە نەکەوتووە، بە گوتارەکەی خۆیدا بچێتەوە و هەڵەکانی لێ بژارکا! جگە لەوەی، زمانی نووسین و ئاخافتنی لە یەکدی جیا نەکردۆتەوە. بۆیە، بە پێویستم نەزانی، هەڵەکانی ڕاسکەمەوە، نیشانەکانی خالبەندیی بۆ دانێم. چونکە، حەزمکرد، لە لایەکەوە، گوتارنووس گوتارەکەی خۆی چۆن نووسیوە، هەر بەو شێوەیەش بلاویکەمەوە. لە لایەکی دیکەشەوە، ئەو زمانە کوردییەی پێی نووسیوە، پێش چاوی خوێنەرانی بخەم!
4. گوتارنووس، چاپی یەکەمی چاوپێکەوتنەکەی وەک سەرچاوە بەکارهێناوە. لەبەرئەوە، ئەو کۆپلانەی لە قسەکانی مامۆستا « برایم ئەحمەد »ەوە وەریگرتووە، لەگەڵ ژمارەی لاپەڕەکانی چاپی دووەم و سێیەمدا ڕێک ناکەون. چونکە، لەو دوو چاپەی دیکەدا، ژمارەی لاپەڕەکانی بەرهەمەکە جیاوازییان هەیە.
5. کاتی خۆی، ڕێکخستنی « پارتی دیمۆکراتی کوردستان » لە « سوید »، ژمارەیەکی زۆریان لەم گوتارە بلاوکردەوە و دانەیەکیشیان بە دەستیی پێشکەش بە خۆم کرد. هەڵبەتە، گوتارەکە دژی مامۆستا « برایم » و بە قازانجی « پارتیی » نووسراوە، بۆیە، وا بەو شێوەیە، کۆپیاندەکرد و دابەشیاندەکرد!
6. لە هێندێ جێدا، گوتارنووس بە دەسپاکییەوە دەقەکانی نەگواستۆتەوە، بەڵکوو، خۆی چۆنی پێ باشبووبێ، هەر بەو شێوەیەش دایڕشتوونەتەوە. جگە لەوەی، ڕێنووسەکەی گۆڕیوە، نیشانەکانی خالبەندیی بۆ دەقە خواستراوەکان دا نەناوەتەوە، لە هێندێ شوێنی دیکەشدا، نموونەی لە قسەکانی مامۆستا وەرگرتووە، بەلام، ژمارەی لاپەڕەکانی دەسنیشان نەکردوە، لەبەرئەوە نازانم، بە ڕاست و درووستیی ئەو دەقانەی گواستۆتەوە، یانا ؟!!

7. زۆربەی لێکدانەوەکان، لەگەڵ یەکدیدا ناکۆکن و پێکەوە ناگونجێن. بەلام، من لێرەدا، بۆیە لێیـان نادوێم و نموونەیان لە سـەر ناهێنمـەوە، چونکە، ئەو قـسـانەی هەر دوو لایان، هیچ پێوەندیەییەکیان بە منەوە نییە.
8. گوتارنووس، پەندیپێشـینان و پەندوەرگرتن لە مـێژووی تێکەڵاوکردووە و جـیـاوازیی لە نێواندا نەکردووە!
9. ئەو نموونانەی « برایم ئەحمەد و تایەر تۆفیق، هێمن و حەمە جەزا » بەو شێوەیە نییە، کە گوتارنووس باسیکردوون. « هێمن »یش مەبەستی لە دەنگی « حەمە جەزا » نەبووە، بەڵکوو، مـەبەسـتی لەوە بووە، هۆنراوەکـانی تێکداوە و بەگـوێرەی ئاوازی گـۆرانیـیـەکـانی خـۆی گونجاندوونی!
10. لە ڕاستیـیدا، ئەز حەزمدەکرد، نەک هەر گوتارنووس، بەڵکوو، هەر نووسـەرێکی دیکەش بووایە، زۆر بە وردیی و بە شـێـوەیەکی زانسـتـانە، لە سـەر ئەم بەرهەمـە بە تایبـەتیی و بەرهەمەکانی دیکەم بە گشتیی بینووسیایە، تا ڕاستیی بۆ جەماوەری خوێنەران، باشتر ڕوون بووایەتەوە. بەلام، گـوتارنووس لە گـوتارەکـەیدا، نەک هەر ڕەخنەی لە دید و بۆچوونەکـانی مـامۆسـتـا نەگرتووە، نەک هەر لایەنە هەڵەکانی، بۆ خـوێنەر دەر نەخسـتووە، نەک هەر هەڵە مێژوویییەکانی، ڕاست نەکـردۆتەوە، بەڵکوو، زۆربەی زۆریشی، بۆ پلارهاویشتن و ئازاردانی مـامۆسـتـا تەرخـانکردووە. ئەوە لە کـاتێکدا نـووسـیـوێتی: وەک کـوردێکی بێ لایەن، بە وەلام هاتووە و داکـۆکیی لە « بارزانیی و پارتیی » ناکا. جا گەر بێ لایەن نەبووایە و داکۆکیی لێ بکردنایە، دەبووایە، چی دیکەی بنووسیایە!
11. لە ڕووی شـێـوە و ناوەڕۆکـەوە، گـوتارەکـە زۆر لاوازە. زۆری هەر پێـوەندیی بە چاوپێکەوتنەکەوە نییە. بەلام، ئەز بۆیە لێرەدا بڵاومکردۆتەوە، تا خوێنەرانی هێژا بزانن، تەنیا ئەو گوتارە لە سەر چاوپێکەوتن و بۆچونەکانی مـامۆسـتـا نووسراوە، کەچیی، ئەو گوتارەش ئەوەیە، کە دەیبینن و دەیخوێننەوە!

* * *

# خڕنووکیش له بیاباندا درەختە!

دوکتۆر حوسێن محەمەد عەزیز

له ڕاستییدا، تەمەنی من، هێندە زۆر نییە، تا بیرەوەرییەکانی خۆم، لەگەڵ مامۆستا « برایم »دا تۆمارکەم. له سەر ئەستێرەیەکی گەشی، درەوشاوەی ئاوابووی ئاسمانی ڕوونی وێژەی کوردیی، وەک مامۆستا بنووسم. له هەموو بەرهەم و کاره « وێژەیی، ڕۆژنامەگەریی، یاساناسیی، کۆمەڵایەتیی، ڕامیاریی، نەتەوەیی، دید و بۆچوون »ەکانی بدوێم و هەڵیانسەنگێنم.
بەڵام، هێندەی لەو ماوە کورتەی، له نزیکەوە ناسیوومە، هەوڵدەدەم، یەکەم: له بەر ڕۆشنایی چاوپێکەوتنەکەی ساڵی «1995» و دووەم: لەو چەن جارەی، له کۆبوونەوە و کۆڕەکانی « لەندەن، برۆکسل و ستۆکهۆڵم »دا دیومە، چەن ووشەیەکی ڕەسەن، له یادی گیانی پاکی مامۆستا « برایم »دا بنووسم، تا خوێنەرانی کورد، چەن ڕاستییەکی بێ چەن و چوون، له بڵندگۆی کوردێکی بێ لایەنەوە ببیستن. «1»
سەرەتا دەمەوێ، بڵێم: به داخەوە، ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد، هەر له کۆنەوە تا ئەورۆ، له دوو لایەنەوە، زۆر به هەڵەدا چوون.
یەکەم: زۆر جار، تا « کەڵەپیاو، هونەرمەند، هۆنەر، نووسەر، زانا، ڕامیار و سەرکردە »کانمان، له ژیاندابوون، خەڵکی کورد، وەک پێویست، ڕێزیان لێ نەگرتوون. بەڵام، کاتێ مردوون، ئینجا دەسی ڕێزیان لێ ناون، قەدریان زانیون، یادیانکردونەتەوە، پەیکەریان بۆ داتاشیون و شەقامی شارەکانیان، پێ ڕازاندۆتەوە. بۆیە، زۆربەی پیاوە ناودار و گەورەکانی کورد، له دەس ئەو پێ نەزانین و خەسڵەتە خراپە، داد و بێ دادیان بووە، دەردی دڵی خۆیان دربڕیوە و گلەییەکی زۆریان کردووە. بۆ نموونە: یەکێکی وەک مامۆستا « نەجمەدین مەلا »، به خۆڕایی نەیگوتووە: « کورد، نەتەوەیەکی زیندووکوژی، مردووپەرستە! »

یا « گۆران »ی هۆنەر و بلیمەت، گەر ئەو خەسڵەتە خراپەی کورد، زۆر کاری تێ نەکردبێ، هەڵبەتە نەیدەگووت:
بەڵێ، دیارە، لە ناو قەومی بەسیتا، قەدری سەنعەتکار
وەکوو عەکسی قەمەر وایە، لە ناو ئاوی لیخندا «119،2»
یا هۆنەری خەمخۆری گەورەی کورد « موفتی پێنجوێنیی »، بە ناهەق نەیگوتووە:
پیاوی گەورەمان، نایەتە بەر دڵ
تاکوو ئەو ڕۆژەی، ئەچێتە ژێر گڵ
ئینجا بۆی ئەگرین، بە جۆش و بە کوڵ
گۆڕەکەی ئەکەین، بە باخچە و بە گوڵ
« موفتیی »، قسەی تۆ ساغە و ڕووبەڕوو
حورمەتی زیندووش بگرە، نەک مردوو
بازێ کە بەربوو، لە دەستت دەرچوو
بۆ مردوو مەگری، بگری بۆ زیندوو «202،3»
هەروەها، « هێمن »یش لەو بارەیەوە نەیدەگوتووت:
بەشی کوردێکی زانا، لەم وڵاتە مەینەت و دەردە
ئەوەی نەتویست، بڵێ: ڕەببی بە دەردی کوردی زانا چێ «135،4»
هەر بۆ ڕاستیی ئەم بۆچوونانەمان، سەیر ئەوەیە، تا، مامۆستا « برایم » خۆی لە ژیاندابوو، هێندێ کەس، قسەیان پێ دەگووت. لە « ناکۆکیی و دووبەرەکیی »یەکەی، ساڵی «1964»ی نێوان « مستەفا بارزانیی » و سەرانی « پارتیی »دا، ئەویان، بە تاوانباری یەکەم دادەنا! «5» کەچیی، کاتێ مامۆستا مرد، هێندێ لەو کەسانە، برووسکەی پرسەنامەیان، بۆ بنەماڵەکەی و « جەلال تاڵەبانیی » نارد، لە کۆڕ و کۆبوونەوەکانیشدا، گەرمەگووتاریان خوێندەوە!
ئای لەو خەڵکە بێ ویژدان و دووڕووە، چۆن دەتوانن، بەو شێوەیە ڕەفتار بکەن؟!! ئایا، گەر « برایم ئەحمەد »، هێزێکی رامیاریی گەورەی، وەک « یەکێتی نیشتمانیی کوردستان »ی لە دواوە نەبووایە، ئەو جۆرە کەسانە، ئەو هەڵەکەسەمایەیان بۆ دەکرد؟!!
لەوانەیە، ئەم خەسڵەتە دزێوە، هەر تەنیا، لە نێو کورددا، بەو شێوەیە بڵاو نەبووبێتەوە. چونکە، ڕۆژێ، گوێم لە « ڕانیە فەرید شەوقیی »، کچی هونەرمەندی ناوداری « میسریی » بوو، لە وەڵامی پرسیارێکدا، گلەییکرد و

گوتی: (له چلەکەی باوکمدا، هەمووی، حەوت هونەرمەند ئامادەبووبوون!)«6»
ئەو هونەرمەندەی، پتر لە پەنجا ساڵی تەمەنی خۆی، بۆ ڕازەکردنی هونەری عەرەبیی تەرخانکرد، کەچیی، هاوپیشەکانی، بەو شێوەیە چلەیان بۆ گرت!
دووەم: کاتێ، نووسەران و شارەزایانی کورد، لە مێژووی ژیان و کارەکانی هەر ڕەوانشادێ دەدوێن، یا، ڕۆڵی سەرکردەیەکی کورد هەڵدەسەنگێنن، تەنیا، لە لایەنە گەش و کردەوە باشەکانی دەدوێن، لایەنە سیس و خراپەکانی، بۆ لێفەپۆشدەکەن. بە تایبەتیی، گەر ئەو کەسە، خزمێکی زۆری هەبێ. یا، خاوەنی بنەماڵەیەکی گەورە و دەسەڵاتدار بێ. یا، هێزێکی چەکداری گەورەی لە پشتەوە بێ. ئیدی، جگە لە پێداهەڵدان و باسکردنی بە چاکە، هیچی دیکە ناڵێن و نانووسن! ئەمەش، خۆی لە خۆیدا، بە هەڵەیەکی گەورە دەژمێررێ، زیانێکی گەورە، لە مێژووی ژیانی ئەو جۆرە پیاوە هەڵکەوتووانە دەدا. واشی لێدێ، کەس باوەڕ بە هیچ نەکا!
ئایا، بە پێی کام باوەڕی زەمینیی و ئاسمانیی ڕەوایە، پیاوێکی ئاسایی، یا کەسێکی خاوەن دەسەڵات، لە ژیانی خۆیدا، هیچ جۆرە هەڵەیە نەکا؟!! زیان لە « خۆی، دەوروبەر و نەتەوە »کەشی نەدا؟!! جا، با ئەو کەسە، تەنانەت، گەورەترین « هۆنەر، نووسەر، هونەرمەند، زانا، ڕامیار و سەرکردە »یەکی هەڵکەوتوو و سەرکەوتووش بێ! بە تایبەتیی، گەر ئەو پیاوە، سەرکردەی گەلێکی بندەس بێ، یا، بەرپرسی پارتێکی ڕامیاریی گەورەی دیاریکراو بێ، یا، بزووتنەوەیەکی چەکداریی مەزن بەڕێوەبەرێ، چۆن دەبێ، هەڵەی نەبێ؟!!
ئەمە، مەگەر هەر لە نێو کۆمەڵە دواکەوتووەکانی، گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەندا، ڕوویدابێ و بەو شێوەیە، ڕۆڵی مێژوویی گەلەپیاوان هەڵسەنگێنرێ!!!
من لەو نهێنییە گەورەیەی کورد تێ ناگەم، بۆچی دەبێ، هەموو کەسێکی زیندوو و مردوو، یەزدانی گەورە، چۆنی دروسکردوون، چۆن هەن، هەر بەو شێوەیە، باس نەکرێن، چاکە و خراپەکانیان، لێک جیا نەکرێنەوە؟!! ئایا، بەپێی ئایینە ئاسمانییەکانیش بێ، هەر کەسێ بە گوێرەی، کردەوەکانی خۆی، نامەی کرداری چاکە و خراپەی بۆ ناخوێنرێتەوە؟!! ئیدی بۆ دەبێ، تەنیا باسی کردەوە چاکەکان و چاوپۆشیش لە کارە خراپەکان بکرێ؟!! باوەڕ ناکەم، هیچ کەسێ هەبێ، لە ژیاندا هەڵە نەکات. ئایا، سەرانی کورد، لە قوڕێکی جیاواز دروسکراون، تا هەڵە نەکەن؟ ئەدی گەر، ئەوان هەڵەیان نەبێ، بۆچی کورد، « 2700 » ساڵە، وا بەو شێوەیە، بە ژێردەسیی و دواکەوتوویی

دەژی؟!! لە مێژووی ڕامیاریی و بزوتنەوەی کوردایەتیی، ئەم سەدو ەنجا ساڵەی ڕابردووشماندا، گەر، چەن ڕابەرێکی مەزنی وەک : « بەدرخان بەگی بۆتان، یەزدانشێر، شێخ عوبێدوڵڵای نەهریی، سمایلاغای سمکۆ، شێخ سەعیدی پیران، شێخ مەحموودی بەرزنجیی، ژەنەڕال ئیحسان نووریی پاشا، سەیید ڕەزای دەرسیمیی، قازیی محەمەد، مەلا مستەفای بارزان، برایم ئەحمەد و ... تاد »، هەڵەیان نەکردبێ، ئەدی چۆن، نەخشەی ژیانیان، بۆ بکێشین؟ چۆن بەسەرهاتەکانی، ژیانی « کۆمەڵایەتیی و ڕامیاریی »یان، بۆ نەوەکانی داهاتوومان تۆمارکەین؟!! بەو نەوانە بڵێین، چی؟!! بۆ هەڵیان خەڵەتێنین؟ جا، گەر وا نییە، ئەو سەرکردە و ڕابەرە ڕامیار و شۆڕشگێڕانە، هەڵە و چەوتییان نەبووە، ئەدی بۆچی، ئەو هەموو هەرسە یەک لە دوا یەکانە، هەرەسی « ڕێکخستنی پارتایەتیی، جولانەوەی ڕامیاریی، بزووتنەوەی چەکداریی، هونەریی و وێژەیی »، تەنانەت هەرەسی ڕەوشتیش، لە مێژووی کورددا ڕوویانداوە؟!! بۆ تا ئێستە، کورد هەر وا بە دواکەوتوویی، لە کاروانی ژیاریی و سەربەخۆیی، نەتەوەکانی جیهان بەجێماوە؟!! یا، گەر ئەوڕۆ، سەرانی « پارتیی » و « یەکێتیی »، هەڵە نەبن، چۆن ئەو هەموو « ماڵوێرانیی و چەرمەسەریی »یە، بە سەر کورددا دێ؟ چۆن لە کوردستانێکی ئازاددا، جەنگی نێوخۆ بەرپادەکەن و بە خۆڕایی، کوڕی کورد بەکوشتدەدەن؟!!

با، زۆر لە باسەکەمان لا نەدەین. هەر وەک لە پێشەکیی، چاوپێکەوتنەکەدا نووسیومە: (دوای کۆدەتاکەی، چواردەی یولی « عەبدولکەریم قاسم »، منداڵێکی تەمەن هەشت نۆ ساڵان بووم، کاتێ، بۆ یەکەم جار لە ژیانمدا، لە دەمی باوکم و مامەکانمەوە، ناوی « برایم ئەحمەد »م بیست.)«5،7»

هەر چەندە، (ناو و ناوبانگی « برایم ئەحمەد »، لە نێو نەوەی ئێمەدا، پتر، لە سەرەتای ساڵەکانی شەستەوە، دەنگیدایەوە. لە هەموو ژیانی خۆمدا، لە نزیکەوە « برایم ئەحمەد »م نەدیبوو.)«5،7» ئیدی، دوای ئەو تەمەنەش، هەر لە دوورەوە ناوی مامۆستام بیستبوو. بەڵام، تا کۆتایی ساڵی «1994»، لە ژیانی خۆمدا، چاوم پێی نەکەوتبوو.

یەکەم جار، لە « لەندەن » بووم، ڕۆژی «1994/12/31»، کۆڕێ، لە لایەن هێندێ ڕووناکبیر و نووسەری کوردەوە، دژی جەنگی چەپەڵی نێوخۆی نێوان « پارتیی » و « یەکێتیی » گیرا. جگە لە نوێنەری هەر دوو لای شەڕکەر، چەن لایەنێکی دیکە و چەن کەسایەتییەکی بێ لایەنیشی لێ بوو.

لەوێ، چاوم بە مامۆستا « برایم » کەوت. کاتێ، خۆمم پێ ناسان، بە زەردەخەنەیەکی بە سۆزەوە، پێشوازیی لێ کردم. ئینجا، زۆر بە گەرمیی، دەسی یەکدیمان گوشیی. پاشان، هێندێ گفتوگۆمانکرد. بەڵام، فریای هیچ نەکەوتین. چونکە، کۆڕەکە دەسیپێکرد. ئیدی، هەر یەکەمان بۆ خۆی، بەبێ دەنگیی دانیشتین و گوێقولاغی هەواڵ و زانیارییەکان بووین.
هەر چەندە، نە کۆڕەکە سەرکەوتووبوو، نە کورد، بە خوێنەوار و نەخوێنەوارییەوە توانی، وەک چەن هاوخوێن و هاوزمانێ، دەمەتەقێیەکی دێمۆکراسییانە و برایانە بکەن. تا، بە تەواویی، لە گرفتە سەرەکییەکە بگەن، چەن پێشنیازێ، بۆ هەر دوو لای شەڕکەر بنێرن. بەڵام، کاتێ مامۆستا « برایم » هەستا و قسەیکرد، زۆر بە هێمنیی و لەسەرخۆ، لە گرفتەکە دوا. کەچیی، لەگەڵ ئەوەشدا، چەن کەسێکی بێ ویژدان، زۆر بە شێوەیەکی خراپ و ناشیرین، وەڵامیاندایەوە. ئەویش، بێ دەنگبوو، وەڵامی نەدانەوە!
ڕۆژی «1995/01/03»، چاوم بە مامۆستا کەوت، لە ماڵی خۆیان دانیشتین و دەسمان بە کارکرد. لە ماوەی ئەو پێنج کاژێرەی، پێکەوە بووین و چاوپێکەوتنەکەمان ئەنجامدا، لە کاتی پرسیار و وەڵامەکاندا، زۆر لە نزیکەوە، سەرنجی هەڵسوکەوتی ئەو پیاوەم دا. بە ڕاستیی، بۆم دەرکەوت، تا بڵێی، پیاوێکی « لەسەرخۆ، هێمن، بە توانا، ژیر و بلیمەت » بوو.
ئەو کاتە، تەمەنی نزیکەی، هەشتاودوو ساڵ بوو. ئەم پیاوە، پێنج دانە کاژێری ڕەبەق، وەک یەکێ، لە « ئەهرام »ە نووکتیژەکانی « میسر »، لە سەر کورسییەک، بەرانبەرم دانیشتبوو. چاوە کزە پچووکەکانی، لە ژێر شووشەی چاویلکەکەیەوە دەبریسکانەوە، کۆچانێکی جوانی بە دەسەوە بوو، لەگەڵ قسە کردندا، جارجار دەیجوڵان و هەموو قورسایی خۆی، دەهاویشتە سەری و لەنگەری خۆی پێ ڕادەگرت.
بەڵێ، پێنج کاژێری تەواو، بە پرسیارکردن بەکیرمهێنابوو. کەچیی، لەو ماوە دوورودرێژەدا، بەرد جولابێ، ئەو لە شوێنی خۆی، جووڵەی نەکرد و هەڵ نەستا، وەک درەختێکی سەوز ڕوابوو. سەری ڕووەو ئاسمان بەرز ڕاگرتبوو، قاچیشی، لە زەوی ڕاستییەکان توندکردبوو. گەلێ بەشانازییەوە، باسی ڕابوردووی خەباتی خۆی دەکرد. زۆر بە هێمنیی، وەڵامی پرسیارەکانی دەدامەوە، بێ ئەوەی، ماندووبوونی پێوە دیاربێ، یا، زویربێ، یا، خۆی لە

وەڵامی پرسیارێکی تایبەتیی و سەخت بدزێتەوە! جگە لەوەی، هێندە بیری تیژبوو، هەموو مێژووی ڕووداوەکان، ناوی جێگە و ناوچەکان، ناوی کەسێتیی و پارتەکانی لە بیرمابوو. بۆ هیچ جۆرە ووشەیەک، لێکدانەوەیەک دانەدەما. بە کوردییەکی پەتیی و ڕەوان دەپەیڤی! بە ڕاستیی، کەسێتیی و لێهاتوویی مامۆستا، زۆر سەرنجی ڕاکێشام، بە شێوەیە، زمانی پاک و شیرین بوو، جێگەیەکی تایبەتیی، لە دڵمدا بۆ خۆی کردەوە.

دوای ئەوەش، چەن جارێ، لە کۆبوونەوەکانی « کۆنگرەی نەتەوەیی »، لە شاری « برۆکسل » یەکدیمان بینییەوە. ئەوەی لای من، جێی سەرسوڕمانبوو، ئەوەبوو، مامۆستا بەو تەمەنەوە، بە هیچ شێوەیە، نە لە دانیشتن، نە لە گوێگرتن، نە لە گفتوگۆکردن، وەڕز نەدەبوو. کەم کەس هەبوو، تا کۆتایی کۆبوونەوەکان، چەن جارێ، نەچنە دەرەوە و هەوا نەگۆڕن. کەچیی، ئەو وەک، بەردی بن ئاو، لە جێی خۆی چەقیبوو! زۆر بە هێمنیی و لە کاتی خۆیدا، بەشداریی لە دەمەتەقێکاندا دەکرد. بیر و ڕای جوان و ڕێکوپێکی دەردەبڕی.

تەنیا جارێ، لە کۆبوونەوەیەکدا، ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبەری « کۆنگرە »، لە سەر چەن شتێ، ڕێک نەدەکەوتن، دەنگەدەنگ دروستبوو، « سەرۆکی پەرلەمانی کوردستان » لە دەرەوەی وولات، « یەشار کایا »، هەر لە خۆیەوە توڕەبوو. لەبەرئەوە، داوای پشوومان کرد و هاتینەدەرەوە. من و مامۆستا، لە قوژبنێکی حەوشەکەدا، پێکەوە وەستابووین. ڕووی دەمی تێکردم و گوتی:

من دەڵێم: ئێمە بە هیچ نابین. تۆ بڵێ: بۆ؟

منیش گوتم: بۆ؟

ئەویش گوتی: لە بەر بۆ؟!

ئیدی، یەکسەر تێگەیشتم، پەنیری ئەو پرسیارە، ئاو زۆر دەکێشێ. هۆکانیشی، هەرچییەک بن، هیچی لە بەرژەوەندیی کورددا نین. لەبەرئەوە، زەردەخەنەیەک گرتمی و بێ دەنگبووم.

ئێوارەی ڕۆژی دووەمی کۆبوونەوەکان، هێندێ لە کارمەندانی «Med TV » هاتن. چەن کەسێکیان، لە نوێنەرانی پارتەکان و بێلایەنی وەک مامۆستا « محەمەد ڕەسووڵ هاوار » و منیشیان، بۆ پەنێلێکی ڕامیاریی تێلێفیزیۆن بانگهێشتکرد. لە پەنێلەکەدا، « عەبدوڵڵا ئۆجەلان »ی سکرتێری « P.K.k»ش، بە تێلێفۆن بەشدارییکرد. ئەو کاتە، ڕۆژی «30-1997/05/31» بوو. لە لایەکەوە، لەشکری تورک، بە هێزێکی زۆرەوە، پەلاماری « باشووری

کوردستان »ی دابوو. له لایەکی دیکەشەوە، گەرمەی جەنگی نێوخۆی، نێوان هێزەکانی « پارتی دیمۆکراتی کوردستان » و گریلاکانی « P.K.K » بوو. کاتێ، نۆرە پرسیاری من هات، لە « نۆجەلان »ی بکەم، پرسیارێکم، دەربارەی باری « رامیاریی و سەربازیی » ناوچەکە بە گشتیی و باشووری کوردستان بە تایبەتیی لێ کرد. « نۆجەلان »، خۆی لە وەلامی پرسیارەکە پاراست، بە شێوەیەکی گشتیی وەلامیدامەوە.« 8 » بۆ رۆژی دوایی، مامۆستا « برایم »م بینی. یەکسەر بانگیکردم و گوتی: تۆ چۆن پرسیاری وای لێ دەکەی؟ بۆ ئەو پیاوەت بەگیرهێنابوو؟ بۆ باسی « ئێران »ی لێ دەپرسی؟ تۆ نازانی، ئەوان باریان چۆنە؟
منیش گوتم: مامۆستا، من بەرژەوەندیی نەتەوەکەم، لە پێش بەرژەوەندیی ئەویش و پارتەکەشییەوە دادەنێم. نامەوێ، ئەو لایەنە شەڕکەرانە، لە پێناوی بەرژەوەندیی تەسکی پارتایەتیی خۆیاندا، لەشکری دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان، لە هەموو لایەکەوە بێنن و هێرشبەرن، کوردستانمان بۆ وێرانکەن و کوڕی کورد و خەڵکی بێ تاوانی، بە خۆڕایی تێدا بکوژرێ. ئیدی، بە ساردییەکەوە، سەرێکی ڕاوەشان و هیچ قسەی نەکرد.
پاشان، کاتێ بۆم دەرکەوت، « کۆنگرەی نەتەوەیی » ئەوە نییە، کە من دەمەوێ، هەر زوو پاشەکشەم لێ کرد. ئیدی، مامۆستام نەدییەوە. تا، دوا جار، کۆمەڵەی « کوردستان ئاوارە » داوەتیانکرد و رۆژی «1997/06/08»، لە شاری « ستۆکهۆڵم »، سیمینارێکی رامیارییان بۆ سازکرد. ئەوەی هەرگیز، لە بیرم ناچێتەوە، ئەوەبوو، زۆر بە کوورتیی و ڕێکوپێکیی، وەلامی پرسیار و رەخنەکانی دەدایەوە. یەکێ لە ئامادەبووان، لێی پرسی و گوتی: ئێمە، واماندەزانی، ئێوە باسێکی مۆدرێن و نوێمان پێشکەشدەکەن. بەلام، هەر چییەکتان گوت، بیستوومانە و کلاسیکیی بوو.
مامۆستاش، زۆر بە هێمنیی وەلامیدایەوە و گوتی: لە بیاباندا، لەبری درەخت، خڕنووک دەڕوێ. بۆیە، خڕنووک بە درەختی بیابان دادەنرێ. منیش ئەو درەختە بووم، لە بیابانی کوردستاندا ڕواوم، لەوە پتر، هیچی دیکەم پێ نەبوو، پێشکەشتانی بکەم! ئیدی، بوو بە پێکەنین و گوێگران لە چەپڵەیاندا!
ئایا، مامۆستا « برایم »، خۆی بە ڕامیار دەزانی؟ سەری لە کاری ڕامیاریی دەردەچوو؟ لە کاری ڕامیاریی پەشیمان نەبوو؟!! من لێرەدا، هەوڵدەدەم، پەلە نەکەم و وەلامی ئەم پرسیارە نەدەمەوە. بەڵکوو، وەلامەکەی، بەرەو ڕووی خۆی

دەکەمەوە. مامۆستا، لە وەڵامی پرسیارێکی لەو چەشنەدا، لە دوو جێگەی چاوپێکەوتنەکەدا، زۆر بە ڕاشکاویی گوتوویەتی: (لەو ڕۆژەوە، دەسم بە کاری ڕامیاریی کردووە، پەشیمانم. دەمتوانی، نووسەر بم. دەمتوانی، هۆنراوە بڵێم. دەمتوانی، شتێ بکەم، بەرێکی هەبێ، ئەنجامێکی هەبێ. بەڵام نەء، ئەگەر ژیان بۆ دواوە بگەڕێتەوە، هەرگیز بە هیچدا ناڕۆمەوە.)«56،7»
هەروەها گوتوویەتی: (وەڵڵا، لە ڕێی نووسینەوە، دەسم پێ دەکردەوە. من، کاتی خۆی، بۆیە چوومە کۆلێژی مافناسیی، کە ببم بە ژۆرنالیست. لە هیچ ڕێکخراوێکی ڕامیارییدا، کارم نەدەکرد. پارتی « هیوا، ئازادیی و ڕزگاریی » و هەمــوو ئەوانە هەبوون. تا « ژ.ک. »، من لە هیچ پارتێکدا ئەندام نەبووم. لەگەڵ ئەوەشدا، بەشداری چالاکیی ڕامیارییم کردووە. هەر لە « شەشی سێپتێمبەری1930 »یەوە، بەشدارییمکردووە. ئێستەش، گەر شتێکم لا ڕوون بووبێتەوە، ئەوەیە: لە دوورەوە دەتوانم، زیاتر کاربکەم، وەک لەوەی، لە ناو ئیشەکەدابم، بە تایبەتیی، گەر ئیش بەو جۆرەبێ، وەک ئەوڕۆ دەکرێ.)«86،7»
هەر چەندە، لێرەدا مامۆستا، مەبەسی ئەوەیە، ئەندامی هیچ پارتێ نییە. بەڵام، هەر کاری ڕامیاریی دەکا. چونکە، کاری ڕامیاریی و پارتایەتیی، دوو شتی جیاوازن. لە هەمان کاتیشدا، زۆر پێکەوە بەستراون. بێ گومان، هەموو مرۆڤێ دەتوانێ، لە یەک کاتدا، هەر دووکیان بکا، ئەندامی پارتێکی دیریکراو بێ و کاری ڕامیاریش بکا. هەروەها، هەموو یەکێکیش دەتوانێ، لە هیچ پارتێکدا ئەندام نەبێ، بەڵام، کاری ڕامیاریی بکا. وا بزانم، ئەم چەن دید و بۆچوونەی مامۆستا، زۆر ڕوونە و پێویستی بە کۆمێنتار نییە!
لە کۆتاییدا دەڵێم: لە لایەکەوە، باری دواکەوتووی، نێوخۆی کۆمەڵی کورد لە هەمــوو ڕوویەکەوە، لە لایەکی دیکەشــەوە، هەم باری بندەسیی کورد و داگیرکردنی کوردستان، لە لایەن دەوڵەتە داگیرکەرەکانەوە، هەم باری تایبەتیی ناوچەکە و جیهانیش، هەرگیز، لە بەرژەوەندیی نەتەوەی کورد و بزووتنەوەی ڕووناکبیریی و ڕامیاریی کوردییدا نەبوون. گەلێ کۆسپ و گرفتی مەزنیان، لە ڕێی پێگەیشتن و گەشەکردنی، کەسێتیی مرۆڤی کورددا دروسکردووە.
مامۆستا وەک ڕامیارێکی کورد، لە سەرەتای ژیانیدا و لەو ماوەیەی، سکرتێری « پارتی دێمۆکراتی کوردستان ـ عێراق » بووە، تاکە سەرکردە و شاسواری، گۆڕەپانی خەباتی ڕامیاریی و کوردایەتیی بووە. گەلێ کاری

گەورەی، بۆ گەلەکەی بە ئەنجامگەیاندووە. گەلێ کادێری « وێژەیی، رامیاریی و نەتەوەپەروەر »ی پێگەیاندووە. بەلام، لە سالی « 1964 » بە دواوە، بە هۆی ئەو « ناکۆکیی و دووبەرەکیی »یەی، لە نێوان سەرانی پارتیی و شۆڕشی چەکداریی «11/سێپتێمبەر »دا پەیدابوو، وردەوردە، ئەستێرەی گەشی گەلاوێژی چانسی رامیاریی « برایم ئەحمەد » کزبوو، ناوی کەمبۆوە، دەسەلاتی لاوازبوو. بە تایبەتیی، دوای رێککەوتنامەکەی «11/مارس/1970»، دەنگ و رەنگی نەما، شوێن پەنجەی، لە چارەنووسی کورد و بڕیارە گرنگەکاندا بزربوو. لە دوورەوە نەبووایە، زۆر خۆی، لە کێشە و باسەکان هەل نەدەقورتان. لابەلا کاریدەکرد. بۆیە، لەو سالانەی دوایی تەمەنیدا، تا، لە ژیاندا بوو، زۆر ناوی نەبوو، بایەخێکی ئەوتۆی پێ نەدەدرا. تەنانەت، هێندێ کەس، لە ناحەز و نەیارەکانی مامۆستا، رەخنەی ئەوەیان لە من دەگرت، گللەیی ئەوەیان دەکرد و دەیانگوت: « برایم ئەحمەد » مردووە، تۆ دەتەوێ، زیندوویکەیتەوە!

هەر چۆنێبێ، مامۆستا « برایم »، پیاوێکی بلیمەت و زانا بوو. رووناکبیرێکی مەزنی بێ وێنەی، سەردەمەکەی خۆی بوو. زۆر ئازابوو. چونکە، گەر ئازا نەبووایە، چۆن دەیتوانی، بێ پشت و پەنا، بێ چەک و چەکدار، بەرەنگاری دەسەلاتی کەلەپیاو و سەرکردەیەکی گەورەی وەک « مستەفا بارزانیی » بێتەوە، ئەو « بارزانیی »یەی، جگە لە چەکدارێکی زۆری هۆزەکەی خۆی، سەرۆکی « پارتیی » و رابەری گەلی باشووری کوردستان بوو، لە هەموو جیهانیشدا ناسرابوو! ئەو « بارزانیی »یەی، هەر چاوی زەقکردایەتەوە و بکۆکیایە، زۆربەی زۆری، ئەندامانی سەرکردایەتی پارتەکەی، تووشی هەلامەت دەبوون!

دەتوانم، بلێم: لەوانەیە، لە سەدەی بیستدا، لە هەموو کوردستاندا، کەلە پیاوێکی بلیمەتی، وای تێدا هەل نەکەوتبێ. بەو شێوەیە، نزیکەی حەفتا سالی، تەمەنی ژیانی، پڕ لە « راونان، گرتن، بریندارکردن، هەولی کوشتن، پێشمەرگەیی، کوێرەوەریی و دەربەدەریی » خۆی، بۆ « خوێندنەوە، نووسین، خەباتکردن و کاری رامیاریی و نەتەوەیی » تەرخانکردبێ.

بەلام، لەگەل هەموو ئەمانەشدا، نە مامۆستا « برایم » و نە هیچ کوردێکی دیکەش، ئەو فریشە بێ هەلە و بێ گوناهە بوون، تا، نوێژ لە سەر داوێنی پاکیان بکرێ. هەروەها، نە ئەو ئەهریمەنە چاوسوورە نینۆک هەلکەوتووی

خـوێناوییـیـە نەکریسـەش بوون، تا بە هـەمـوو جـۆرێ، نەفـرەتیـان لێ بکرێ. کـوڵەباخیش، هـەر چەندە « ڕەنگاوڕەنگ، گەش، جـوان و بۆنخـۆش »یش بێ، هێشتا، بەشی خۆی هەر دڕکی هەیە!
مـامۆسـتا « برایم »، مرۆڤ بوو. لە گۆشت و ئێسک دروسـبوویـوو. لە ئاسن و پۆڵا دروس نەبووبوو. هەمـوو مـرۆڤێکیش، چاکە و خراپەی خۆی هەیە. کـاری باش و هەڵەشدەکا. تەنانەت، پەیامبەرانیش هەڵەیانکردووە. ئەوەی هەڵە ناکا، تەنیا هەر خـوایە. یا، ئەو جۆرە کـەسانەن، کە هەرگیز کار ناکەن. ئەمەش، لە هیچ شوێنێکی ئەم جیهانەدا نە بووە و نە دەبێ!
بەڵام، لەگـەڵ ئەوەشـدا، هیچ کـوردێ ناتوانێ، هەر وا بە ئاسـانیی، هێڵێکی ڕاست و چەپ، بە سـەر حـەفـتـا سـاڵی تەمـەنی، پڕ لە خـەباتی « وێژەیی، ڕۆژنامەگەریی، کۆمەلایەتیی، ڕامیاریی، پێشمەرگەیی و نەتەوەیی » مامۆستا « برایم »دا بێنێ. مـەگـەر، ئەوانەی هەمـوو ژیانیان، خـۆشیـان نەویسـتووە و دژایەتییـیان کردووە. یا، لە ئاستی ڕاستییدا، « چاویان کوێر، گوێیان کـەڕ، زمانـیان لاڵ، دڵیـان ڕەش و بیریان تاریک »ە! ئەگینا، تازە ئەو پیاوە، جێگەی خۆی، لە نێو لاپەڕە پرشنگدارەکانی مێژووی کورددا کردەوە.
هـەر چەندە، کـورد گوتوویەتـی: لە پاش مردن، ڕەحـمـەت باشـە. بەڵام، لەگەڵ ئەوەشـدا، بە لای منەوە، لە باری سەرنجی نەتەوەییـیەوە دەڵێم: گەر، تاکە یەک هەڵە و پەڵەی ڕەش، لە ژیانی ڕامیاریی مامۆسـتا « برایم »دا هەبێ، ئەوا، ئەو مـاوەیەی، نێوان سـالانی « 1966-1970 »یە، کـە هـاوکاریی، لەگـەڵ دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »دا دەکرد.
بریا، ئەو گـەلێنە گەورەیە، لـە دیواری ئەسـتوور و گـەشـتی ژیانی ڕامـیـاریی، مـامـۆسـتـادا نەبووایە! بریا، مـامـۆسـتـا وەک بلیـمـەتێکی هەڵکەوتووی سـەردەمەکەی خۆی، دەور و پشتی « بارزانیی » چۆڵ نەکردایە، تا، وەک دوو سـەرکردەی ڕامیاریی و سەربازیی، پێکەوە بۆ کورد بکۆشانایە، تا، هێندێ لە هەڵپـەرستەکـانی، نێو سـەرکـردایەتی « پارتیی »، هـەلیان بۆ نەڕەخسـایە و کـەڵکیـان، لەو « دووبەرەکـیی و بۆشـایی »یە وەر نەگـرتایە! جـا، ئەو کـاتە دەمـانزانی، کـار و باری « پارتیی و شـۆڕش »مکـەش، بە چ شێوەیەک دەگۆڕا! چەن زووتر، گەلی « باشـووری کوردسـتـان »، بە مـافـەکـانی خـۆی دەگـەیشت!
ئەوڕۆش، باری کورد بەو شێوەیە نەدەگەیشت! بەڵام، لە بریا هیچ شین نابێ!
لەگـەڵ ئـەوەشـدا، نەک هـەر مـامـۆسـتـا « برایم »، بـەڵکوو، چەندین کـەڵەپیـاوی

هەڵکەوتووی کوردی وەک ئەویش، گەر کورد نەبوونایە، ئەندامی هەر نەتەوەیەکی دیکەی ئەم جیهانە بوونایە، ئەوا، هەرگیز لەو کەڵەپیاو و بلیمەتانەی، نەتەوەکانی دیکەی جیهان کەمتر نەدەبوون. بگرە، دووریش نییە، لەوانیشیان تێپەڕاندایە.
بەڵام، چی بکەین؟ بڵێین چی؟ هەر ئەو پیاوانەمان هەبوون! ئەوانیش، ڕۆڵەی نەتەوەیەکی هەژار و بندەس بوون، کورد بوون، بۆ کورد تێکۆشاون، بە نائومێدیی سەریان نایەوە و بە ئامانجی خۆشیان نەگەیشتن.
بە داخەوە، کوردیش هەر هێندە، ڕێز لە پیاوە ناودارەکانی خۆی دەگرێ. چونکە، « قەدری زێڕ، لای زێڕینگەرە ». هەر چەندە، کورد هەمیشە زێڕی زۆر بووە، بەڵام، هەرگیز خۆی زێڕینگەرێکی باش نەبووە!
دەبا، لە یادی مامۆستا « برایم »دا، گیانی پاکی، هەموو خەباتگێڕانی کورد، لە هێلانەی « یاقووت و زمرووت »ی، پڕ لە هێمنیی و ئارامی، یەکێ لە « دارە مروارییـ »ـیەکانی بەهەشتی بەریندا، تاهەتایە ئۆقرەبگرێ. دەبا، لە یادی مامۆستا « برایم »دا، پەند لە مێژوو وەرگرین، هەموومان هەر تەنیا، ڕوو لە ڕووگەی « کوردایەتیی » کەین. « برایەتیی، تەبایی و یەکێتیی کورد و کورد »، تەنیا ئامانج و هیوامان بێ!

ستۆکهۆڵم
2000/06/21

## سەرچاوە و تێبینییەکان

1. هێندێ جار، هێندێ کەس و لایەن، داوایان لێ کردووم، شتێ لە سەر کۆچکردووەکانیان بنووسم. بەڵام، جگە لە نووسینەکەی شەهید « جەلالی حاجی حوسێن »، کە بە ویست و ئارەزووی خۆم نووسیومە، هیچ شتێکم بۆ کەس نەنووسیوە. بۆیە، هێندێ لەو کەسانە، لێم زویربوون! کەچیی، کاتێ سەرنووسەری گۆڤاری « گزینگ »، داوای لێ کردم، بە بۆنەی کۆچیدوایی مامۆستا « برایم » و چاوپێکەوتنەکەوە، گوتارێ بنووسم، دوای دەمەتەقێیەکی نێوانمان، قایلبووم. بەو مەرجەی، خۆم چی دەنووسم، بڵاویکاتەوە.
2. گۆران، دیوان، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، بەغدا، 1980.
3. موفتی پێنجوێنیی، دیوان، چاپی یەکەم، بەغدا، 1990.
4. هێمن، دیوان، تاریک و ڕوون، عێراق، 1974.
5. بۆ ئەمەش، لە کاتی پێویستی خۆیدا، هەوڵدەدەین، هۆی ئەو ناکۆکیی و دووبەرەکییە، بە درێژیی ڕوونکەینەوە. چونکە، پرشکی هەڵە و تاوانی، ئەو ناکۆکیی و دووبەرەکییە، تەنیا لە ئەستۆی یەک کەس و یەک لایەندا نییە. بەڵکوو، هەموو ئەو کەس و لایەنانەی بەشداریی

سەرکردایەتی « پارتیی و شۆڕش »یان کردووە، بە قەدەر قەبارە و کێشی خۆیان، بە قەدەر دەسەڵاتی رامیاریی و سەربازیی خۆیان، دەستیان لە درووستکردنی ئەو بارە ناهەموارەی، دووبەرەکییەکەدا هەبووە و گوناهبارن!

6. لە چاوپێکەوتنێکی « رانیە فەرید شەوقیی »، لە تێلێفیزیۆنی ئاسمانیی « میسر »ەوە وەرگیراوە.

7. حوسێن محەممەد عەزیز، پێنج کاتژمێر لەگەڵ برایم ئەحمەددا، چاپی یەکەم، چاپخانەی باران، ستۆکهۆڵم ـ سوید، 1995.

8. کاسێتی پەنێلەکە لای خۆم هەیە.

9. بۆ زانیاریی خوێنەران، ئەم گوتارە، تا ئێستە، دوو جـار بڵاوکراوەتەوە، لە تێلێفیزیۆنی « Kurdsat »یشدا خوێندراوەتەوە. جاری یەکەم، لە گۆڤاری « گزینگ »ی ژمارە « 28 » لە « سوید »، جاری دووەمیش، لە رۆژنامـەی « ئاڵای ئازادیـی » ژمارە « 378 » لە « باشووری کوردستان ـ سولەیمانیی » چاپ و بڵاو کراوەتەوە.

لە گۆڤاری « گزینگ »دا، سەرنووسەرەکەی، ئەم چەن دێڕەی، وەک پێشەکیی، بۆ گوتارەکە نووسیوە، وا لێرەدا، بێ ئەوەی، دەسکاریی رێنووسەکەی بکەم و نیشانەکانی « خاڵبەندیی » بۆ دابنێم، دەینووسمەوە.

(ژمارە 27ی گزینگ تازە رەوانەی چاپ کرابوو کە هەواڵی کۆچیی دوایی مامۆستا « ئیبراهیم ئەحمەد » (١٩١٤ - ٢٠٠٠) لە رێگەی میدیای ناوەوە و دەرەوەی کوردستان بڵاو کراوەتەوە.

دیارە، کەسایەتی بەرزی سیاسی و ئەدەبی و رۆژنامەوانیی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بۆ هەمـوان روون و ئاشکرایە و حەوجی بە گوتن نییە کە مامۆستا تا ئەو کاتەی کە لە یەکێک لە نەخۆشخانەکانی شاری لەندەن ، لە رۆژی ٨ ئاوریلی ساڵی ٢٠٠٠ بۆ هەمیشە ماڵئاوایی لە ژیان کرد. هەروا، لە بواری کار و تێکۆشانی سیاسی و خزمەت بە گەل و نەتەوەی کورد، چالاک مایەوە.

لێرەدا، بۆ رێزگرتن لە یادی ئەو ئەدیب و رۆژنامەوان و سیاسەتمەدار و، هەروەها یەکێک لە ئەندامە بە ئەمەکەکانی (کۆمەڵەی ژ، ک ـ لقی سلێمانی)....، ئەم نووسراوەی بەڕێز د. حوسێن عەزیز کە لە سـەر داوای « گزینگ » هەر بەو بۆنەیەوە نووسراوە، پێشکەشی خوێنەرەوان و لایەنگرانی مامۆستای کۆچکردوو دەکەین. یادی هەر زیندوو بێ و رەوانی شاد. (بۆ زانیاریی زیاتر لە سەر مامۆستا بە قەڵەمی خۆی، بروانە: «لە بیرەوەرییەکانم...» ، گزینگ ، ژمارە١٣ ، پاییزی ١٩٩٦) (گزینگ)

* * *

